


## تەفسیر و ڕوونکردنەوەی

# گەورەترین سورەت لە قورئاندا

## لەژێر تیشکی قورئان و سوننەتدا







دانانی
محمدی کوڕی جەمیل زینۆ

وەرگێڕانی
عطا محمد حمه سعید پێنجوێنی


چاپی دووەم

www.iqra.ahlamontada.com




## تەفسیر و ڕوون کردنەوەی

# گەورەترین سورەت لە قورئاندا

## لە ژێر تیشکی قورئان و سوننەتدا

دانانی

محمدی کوڕی جەمیل زینۆ

وەرگێڕانی

عطا محمد حمه سعید پێنجوێنی

چاپی یەکەم

www.iqra.ahlamontada.com



## پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله و كفى و الصلاة و السلام على رسول الله المصطفى و على آلـــه و صحبه و من والاه .

برایانی بەڕێز و خۆشەویستم ئەمەی کە بەرچاوتان دەکەوێت پەڕاوی (تەفسیر و ڕوونکردنەوەی گەورەترین سوورەت لـــە قورئـانـدا) یـە کە دانراوی مامۆستای بەڕێز (موحەمەدی کوڕی جەمیل زینۆ)یە ، کە چەند برایەك داوایان لێ کردم کە وەری بگێڕم بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەو سوود و کەڵکە زۆرەی کە پەڕاوەکە لە خۆیی گرتووە ، چونکە بەو شێوەیە داوامان لێ کراوە کە لە هەموو سورەتەکانی قورئان تێ بگەین وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بۆیان تەفسیر کردووین و ڕوونیان کردۆتەوە بۆمان ، ئەوەش ڕوونە کە سوورەتی فاتیحە گەورەترین و پیرۆز ترین سوورەتە لە قورئاندا چونکە هەرسێ جۆرەکەی یەکخواپەرستی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە ، وە هەرکەس پەڕاوەکە بخوێنێتەوە لە هەموو واتاکانی سوورەتی فاتیحە تێ دەگات کە بەجواترین شێوە تەفسیر کراوە لەسەر بچینەی تەفسیر کردن بە قورئان و سوننەت و وتەی هاوەڵان و زانایان کە ئەمەش باشترین جۆری تەفسیرەکە دەیان بەڵگەی لەسەرە لە قورئان و سوننەتدا ، وە هیوادارام کە چۆن لە دوای خوێندنەوەی ئەم پەڕاوە لە سوورەتی فاتیحە تێ دەگەین و شارەزا دەبین بەو شێوەیەش لە سوورەتەکانی تری قورئان تێ بگەین خوای گەورەش خۆی یارمەتی دەرە

براتان
عطاء محمد حمە سعید پێنجوێنی
١٩٩٩/٨/١٠

www.iqra.ahlamontada.com

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و من سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادى له و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له و أشهد أن محمدا عبده و رسوله

﴿ يا أيها الذين آمنوا أتقوا الله حق تقاته و لا تموتن إلا و أنتم مسلمون ﴾ (آل عمران/١٠٢)

﴿ يا أيها الناس إتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة و خلق منها زوجها و بث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به و الأرحام إن الله كان عليكم رقيبا ﴾ (النساء/١)

﴿ يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله و قولوا قولا سديدا ، يصلح لكم أعمالكم و يغفر لكم ذنوبكم و من يطع الله و رسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ (الأحزاب/٧٠)

*أما بعد :*

فإن أصدق الحديث كتاب الله و خير الهدي هدي محمد ﷺ و شر الأمور محدثاتها و كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار .

لە دوای ئەوە بە پشتیوانی خوای گەورە تەفسیری سوورەتی فاتیحە پێشکەشی خوێنەر دەکەم ، چونکە بە ڕاستی گەورەترین سوورەتە لە قورئاندا ، وە لەبەر ئەوەش نوێژکەر لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا دەیخوێنێت ، ئەوەش واجبە کە لە ماناکەی تێ بگات بۆ ئەوەی زیاتر مل کەچ بێت لە نوێژەکەیدا ، وە بەر ئەو ئایەتەی خوای گەورە بکەوێت کە دەفەرموێت : ﴿ قد أفلح المؤمنون * الذين هم في صلاتهم خاشعون ﴾ (المؤمنون /١-٢)

واتە(ئەو باوەڕدارانە سەرکەوتن ، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا مل کەچ بوون) .

وە ئەم سوورەتە جۆرەکانی یەکخواپەرستی تێدایە ، بە تایبەتی یەکخواپەرستی لە پەرستندا کە خوای گەورە جیهانی تەنها لەبەر ئەوە دروست کردووە و خوڵقاندووە ، و پێغەمبەرانیشی ناردووە بۆ بەرجەستە کردنی ئەمەش لەو ئایەتەدا دەردەکەوێت کە دەفەرموێت : ﴿ إياك نعبد و إياك نستعين ﴾ (الفاتحة/٥)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (تەنها تۆ دەپەرستین خوایە وە داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەخوازین) .

وەلەبەر ئەوەش کە هەموو مانای قورئان بۆ مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەگەڕێتەوە ،وە بۆ داڕشتنی ئەم کارە پیرۆزەش گرنگترین سەرچاوەم: تەفسیری (طبري) و (إبن كثير) ە لەگەڵ کورت کراوەکانیان (مختصراته) .

وە گشت ئەو فەرموودانەم باس کردووە کە باس لە گەورەیی و تەفسیر کردنی سوورەتی فاتیحە دەکەن ، وە گشت ئەو ئایەت و سوورەت و فەرموودانەش کە سوود بە بابەتەکە دەگەیەنن .

وە دیارترینی ئەو هەڵە دەرکەوتووانەی کە لە خوێندنی فاتیحە و بابەتە گرنگەکانی تردا دەکرێ خستومەتە ڕوو و ڕوونم کردۆتەوە ، وە کێش زیاتر تێگەیشتنی دەوێ با پەڕاوەکە بخوێنێتەوەو ئەوبابەتانەشی کەلە کۆتاییەکەیدا دەبینرێ.

وە داوا لە خوای گەورە دەکەم کە بیکاتە جێگای سوود بۆ موسوڵمانان ، وە بیگێڕێت بە کارێکی دڵسۆزانە تەنها لەبەر ئەو .

١ی ربیعولئەوەل ١٤١٧

محمدی کوڕی جمیل زینو

www.iqra.ahlamontada.com

# چۆن قورئان تەفسیر بکەین؟

## ١) تەفسیر کردنی قورئان بە قورئان :

بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ملك يوم الدين ﴾ (الفاتحة/٤)

واتە : (پاشای ڕۆژی قیامەت) تەفسیرەکەی لەو ئایەتەی خوای گەورەدا هاتووە کە دەفەرموێت : ﴿ و ما أدريك ما يوم الدين ثم ما أدريك ما يوم الدين؟ يوم لا تملك نفس لنفس شيئا و الأمر يومئذ لله ﴾ (الإنفطار/١٨)

واتە : (تۆ چوزانی ڕۆژی قیامەت ئینجا تۆ چوزانی ڕۆژی قیامەت ؟ ڕۆژێکە کە هیچ کەسێك بۆ هیچ کەسێکی تر هیچی پێ ناکرێ ، وە تەواوی کار و فرمان لەو ڕۆژەدا تایبەت بە خوای گەورەیە) .

## ٢) تەفسیر کردنی قورئان بە فەرمودە :

کە ڕوون کەرەوەیەکی قورئانە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ و أنزلنا إليك الذكر لتبين للناس ما نزل إليهم و لعلهم يتفكرون ﴾ (النحل/٤٤)

واتە : (ئێمە قورئانمان بۆ ناردویتە خوارەوە تا بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە کە چی‌یان بۆ هاتۆتە خوارەوە بەڵکو بیر بکەنەوە) .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (الا و انى اوتيت القرآن و مثله معه) [١]

واتە : (بەڵێ من قورئانم پێ بەخشراوە وە نمونەی ئەوەش کە سوننەتە)

وەنمونەی ئەو ووتەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ (الصراط :الإسلام) [٢]

واتە : (الصراط : ئیسلامە) .

وە نمونەیەکی‌تر دەفەرموێ (المغضوب عليهم : اليهود ، و الضالين : النصارى) [٣]

---

(١) (صحيح رواه أبو داود)

(٢) (حسن صحيح رواه الترمذى)

(٣) (حسنه محقق جامع الأصول)

www.iqra.ahlamontada.com

وە نمونەیەکی‌تر دەفەرموێ : (المغضوب عليهم : اليهود ، و الضـــالين : النصارى) [١] واتە : ( -المغضوب عليهم : جوولەکەن ، وە -الضالين- : گاورەکانن) .

**٣) تەفسیر کردنی قورئان بە ووتەی هاوەڵان :**

ئیبنو عەباس سەبارەت بەو ووتەیەی خوای گەورە کە دەفەرموێت : ﴿ أو لمستم النساء ﴾ دەفەرموێت واتە (جامعتم) (کۆبوونەوە لەگەڵ ئافرەت دەگرێتەوە) (ابن كثير لە تەفسیرەکەیدا باسی دەکات) .

**٤) تەفسیر کردنی قورئان بە ووتەی شوێن کەوتووان (التابعين)**

چونکە ڕاستەوخۆ لە هاوەڵانیان وەرگرتووە ، بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ثم استوى إلى السماء ﴾ (البقرة/٢٩)

موجاهید و ئەبولعالیە دەڵێن (استوى) بە واتای (علا و ارتفع) [٢]

کەواتە مانای ئایەتە (ئینجا خوای گەورە بەرز و بڵند بوویەو لەسەر ئاسمان)

**٥) تەفسیر کردنی قورئان بە زمانی عەرەبی**

بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ إياك نعبد و إياك نستعين ﴾ (الفاتحة/٥)

لێرەدا خوای گەورە مەفعولەکە کە (إياك) یە پێشی خستووە بەسەر فعلی (نعبد ، نســتعين) دا بۆ جیاکردنەوەو تایبەتمەندی ، واتە تەنها هەر تۆ دەپەرستین ، وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین .

ئەڵێم : بۆیە خوای گەورە مەفولەکەی پێش خستووە بەسەر فعلەکەدا چونکە ئەگەر بیفەرموایە : (نعبد إياك) وا گومان دەبرا کە یەکێکی تر لەگەڵ خوای گەورەدا دەپەرسترێ یان زیاتر بەڵام کەدەفەرموێت : ﴿ إيـاك نعبـد ﴾ جیـای دەکاتـەوە و تایبەتمەندی دەکات بەوەی کە تەنها خوای گەورە شایەنی ئەوەیە کە بپەرسترێ ((وەرگێڕ)).

---

(١) (حسنه محقق جامع الأصول)

(٢) (رواه البخاري)

www.iqra.ahlamontada.com

# واتای سورەت و ئایەت

## ١) سورەت :

بەشێکە لە قورئانەکەی خوای گەورە کە سێ ئایەت دەگرێتەوە یان زیاتر .

وە سورەتەکانی قورئانیپیرۆز (١١٤) سورەتە ، درێژ ترینیان سورەتی (البقرة) یە وە کورت ترینیان سورەتی (الکوثر) ە .

ووشەی (السورة) : لە (سور) ی شارەوە وەرگیراوە بەهۆی بڵندی و بەرزی شان و شەوکەتی ، یان لە (سؤر) ی خواردنەوە وەرگیراوە ، کە بەمانای مانەوە دێت ، مانەوەش بەمانای ئەوە کە سورەت بە بەشێك لە قورئان دێت ، بەڵام بۆچونی یەکەم کە دەڵێ لە بەرزی و بڵندیەوە وەرگیراوە بەهێزترە ، وە ئەو ووتەیەی شاعیر شایەتی ئەم بۆچوونە دەدات کە دەڵێ :

ألم تر أن الله أعطاك سورة ترى كل ملك دونها يتذبذب

واتە : ئەوە بۆ نابینی کە خوای گەورە بەرزییەکی پێ داوی

هەموو پاشایەك دەبینرێ لە ژێریدا دێتە لەرزە

## ٢) ئایەت :

ئەسڵی واتاکەی (العلامة) یە واتە نیشانە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إن آيه ملكها ان يأتيكم التابوت فيه سكينة من ربكم ﴾ (البقرة/٢٤٨)

واتە : (پێغەمبەرەکەیان پێی ووتن : نیشانەی بەرەکەتی (طالوت) لەسەرتان ئەوەیە کە تابوتەکەتان بۆ دەگێڕێتەوەو دەتان داتێ) .

وە ئایەت : بریتییە لە ڕستەیەکی سەربەخۆ سەبارەت بە پێش و دوای خۆیەوە وە لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ خوێندنەکەی دەپچڕاند ئایەت بە ئایەت واتە لەسەری هەموو ئایەتێکدا دەوەستا دەیفەرموو : (الحمد لله رب العالمين) ئینجا دەوەستا (الرحمن الرحيم) ئینجا دەوەستا هەتا کۆتایی سوورەتەکە [1] .

---

(١) (صحيح رواه الترمذي)

www.iqra.ahlamontada.com

وە ئایەت بە (شتێك كە پێچەوانەی باوە) بەم واتایەش دێت وەكو خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ و قالوا لولا نزل علیه آیة من ربه ﴾ (الأنعام/٣٧)

تەفسیری ئەم ئایەتە لەو ئایەتەی تردا هاتووە كە دەفەرموێ ﴿ و قالوا لن نؤمن لك حتى تفجر لنا من الأرض ينبوعا ﴾ (سورة الإسراء)

واتای هەردوو ئایەتەكە (( ووتیان بۆچی موعجیزەیەك و نیشانەیەكی لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆ نەنێردراوە ))

تەفسیرەكەی لە ئایەتەكەی تردا (( ئێمە هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین هەتا لەم زەویە وشك و بێ ئاوەدا كانییەكمان بۆ هەڵنەقوڵێنی ))

## سورەتی فاتیحەو ناوەكانی

سورەتی فاتیحە لە مەككە هاتۆتە خوارەوە و حەوت ئایەتە بەبێ جیاوازی و ئیختیلاف وە ناوەكانیشی

١) **أم القرآن** : لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن ، فهي حداج ، خداج ، خداج غير تمام) [١]

واتە: (هەركەس نوێژێك بكات و (أم القرآن) ی تیا نەخوێنێ ئەوا نوێژەكەی تەواو نییە ، تەواو نییە ، تەواو نییە)

٢) **أم الكتاب** : بوخاری دەفەرموێ بۆیە ناو نراوە (ام الكتاب) چونكە لە قورئاندا یەكەم سورەت بەم دەست پێ دەكات ، وە لە نوێژیشدا یەكەم شت بەم دەست پێ دەكرێت

٣) **السبع المثاني** : خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ و لقد اتينك سبعا من المثاني و القرآن العظيم ﴾ (الحجر/٨٧)

واتە (بەڕاستی ئێمە حەوت ئایەتی سورەتی سوپاسمان بە تۆداوە كە دووپات دەكرێتەوە وە جگە لەوەش قورئانی گەورەمان بە تۆ داوە)

---

(١) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

٤) **القرآن العظيم**: خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و لقد اتينك سبعا من المثاني و القرآن العظيم ﴾ (الحجر/٨٧).

وە بەڵگەی ئەم چوار ناوە لە فەرموودەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (الحمد لله رب العالمين : أم القرآن ، و أم الكتاب ، و السبع المثانى ، و القرآن العظيم) [١]

واتە : (الحمد لله رب العالمين : دایکی قورئانە ، دایکی پەڕاوە ، وە حەوت ئایەتە کە دووبارە دەکرێنەوە ، وە قورئانی گەورەیە) .

٥) **فاتحة الكتاب** : چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (لا صلاة لمن لم يقـرأ بفاتحة الكتاب) [٢]

واتە : نوێژی کەسێك دروست نییە هەتا فاتیحەی کتابی تیا نەخوێنێت واتە (دەست پێ کردنی قورئان) وە بۆیە ناو نراوە بە (فاتحة الكتاب) چونکە نوێژکەر یەکەم جار بەوە دەست پێ دەکات.

٦) **الصلاة** : پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاری‌یەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (قسمت الصلاة بينى و بين عبدى نصفين ، فإذا خال العبـد الحمـد لله رب العالمين ، قال الله حمدنى عبدى).... الحديث [٣]

واتە :سورەتی فاتیحەم بەش کردووە لە نێوانی خۆم و بەندەکەمدا بەنیوەیی ، کاتێ بەندەکەم دەڵێ سوپاس بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان ، خوای گەورە دەفەرموێ بەندەکەم سوپاسی کردم) .... فەرموودەکە . لێرەدا فاتیحە بە نوێژ ناوبراوە چونکە مەرجێکە بۆ تەواویی نوێژ .

٧) **الحمد** : لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ الحمد لله رب العالمين ﴾

٨) **الرقية** : لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبی سەعیدی فەرموو : (و مـا يدريك أنها رقيه)؟ واتە : تۆ چوزانی ئەوە پەنا گرتنەو نزایە.

---

(١) (صحيح رواه البخاري) (٢) (متفق عليه) (٣) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

٩) **أساس القرآن :** ئەم ناوە ئیبنو عەبباس لێی ناوە واتە بنچینەی قورئان .

١٠) **الواقیة :** ئەم ناوەش سوفیانی کوڕی عویەینە لێی ناوە واتە خۆپێ پاراستن .

١١) **الكافیة:** ئەم ناوەش یەحیای کوڕی کثیر لێی ناوە کە لە (کفی) وە هاتووە بە مانای (ئەوندە بەسە بۆی) .

## لە گەورەیی و بەڕێزی سورەتی فاتیحە

### فەرموودەی یەکەم :

لە ئەبی سەعیدی کوڕی موعەللاوە ﷺ دەفەرموێ ڕۆژێك نوێژم دەکرد پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم منیش وەڵامم نەدایەوە هەتا نوێژەکەم تەواو کرد ئینجا هاتم بۆلای و فەرمووی چی وای لێ کردی کە وەڵامم نەدەیتەوە؟ ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا نوێژم دەکرد فەرمووی : باشە خوا گەورە نافەرموێ ﴿ یا أیها الذین آمنوا استجیبوا لله و للرسول إذا دعاکم لما یحییکم ﴾ (الأنفال/٢٤)

واتە : (ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوەوەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کە بانگتان دەکەن بۆ شتێك کە چاکەی بۆ ئێوە تێدایە) .

ئینجا فەرمووی : گەورەترین سورەتت لە قورئاندا فێر دەکەم پێش ئەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە ، ئینجا دەستی گرتم ، کە ویستی بچێتە دەرەوە ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت : گەورەترین سورەتت لە قورئاندا فێر دەکەم فەرمووی بەڵێ : ﴿ الحمد لله رب العالمین ﴾ حەوت ئایەتن کە دووبارە دەکرێنەوە وە قورئانی گەورەیە کە پێم بەخشراوە [1]

---

(١) (بوخاری و جگە لەریش گێراویانەتەوە)

www.iqra.ahlamontada.com

## لە سوودی فەرموودەکە

١) شیاوێتی بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ لە کەسێك کە نوێژی سوننەت بکات ، وە ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ ، وە تایبەتە بە ژیانی ئەوەوە ، بە هەمان شێوە بۆ دایکیش شیاوە کە بانگی منداڵەکەی بکات لە نوێژی سوننەتدا ، وە شاهیدیش بۆ ئەمە فەرموودەی ئەو ڕاهیبەیە کە دایکی بانگی لێ کرد بەڵام جوابی نەدایەوە ، دایکیشی دۆعای لێ کرد و خوای گەورەش پاڕانەوەکەی وەرگرت ، وەکو چۆن لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە .

بەڵام جگە لە پێغەمبەر ﷺ و دایك ، ئیتر شیاو نی یە بانگ کردنی هیچ کەسێك کە نوێژ بکات ، وە لەسەر نوێژکەریش پێویستە کە وەڵامی کەس نەداتەوە لە کاتێکدا کە نوێژ دەکات مەگەر بۆ فریاکەوتنی کەسێك لە مەترسیەك یان لە ناچاری‌دا .

٢) واجبی وەڵام دانەوەی بانگی پێغەمبەر ﷺ چونکە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ یا أیهاالذین آمنوا استجیبوا لله و للرسول إذا دعاکم لما یحییکم ﴾ (الأنفال/٢٤)

٣) سوور بونی پێغەمبەر ﷺ و حەز کردنی لەسەر فێر کردنی هاوەڵەکانی بەو شتەی کە سوودیان پێ دەگەیەنێ ، کە فەرمووی : (لاعلمنك أعظم سورة في القرآن) واتە : (گەورەترین سورەتت لە قورئان فێر دەکەم)

٤) سور بوونی هاوەڵان لەسەر زانست ، وە بیر خستنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڵێن هاوەڵەکەوە بەوەی کە پەیمانی پێدا ، وە ئەمەش کاتێك کە ووتی :ئەی پێغەمبەری خوا تۆ وتت گەورەترین سورەتت لە قورئاندا فێردەکەم .

٥) وەڵامدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵەکەی ، وە وەفای بۆ هاوەڵەکەی بەوەی کە پەیمانی پێدا کە ﴿ الحمد لله ربالعالمین ﴾ ی فێر کرد.

٦) فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سورەتی فاتیحە گەورەترین سورەتە لە قورئاندا کە حەوت ئایەتە دووبارە دەکرێتەوە (سبع المثانی) وە قورئانی گەورەشە.

## فەرموودەی دووەم :

www.iqra.ahlamontada.com

## فەرموودەی دووەم :

لە ئەبی سەعیدی خودری‌یەوە ﷺ دەڵێ : ئێمە لە سەفەردا بووین ، لاماندا شوێنێك ، کارەکەرێکی کچ هات وتی : گەورەی شوێنەکەمان مار یان دووپشك پێوەی داوە ، وە کەسیشمان نی‌یە بۆ چارەسەر ئایا پەناو پاڕانەوەیەکتان لا هەیە؟ ئیتر پیاوێك هەستا بە هیچ تاوانبارمان نەدەکرد واتە پیاوێکی چاك بوو ، وە پەنای دا و فەرمانی کرد کە (٣٠) مەڕی بدەنێ ، وە شیریشی داینێ ، کاتێك کە گەڕاینەوە پێمان وت : ئەوە کارێکی باشت کرد یان ئەوە پەنات دا؟ ووتی : نەخێر پەنام نەدا مەگەر بە (ام الکتاب) سورەتی فاتیحە نەبێت وتمان قسەمەکە هەتا دەچین بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ دەکەین ، کاتێك کە گەیشتینە مەدینە گێڕامانەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (و ما کان یدریه انها رقیه ؟ اقسموا و اضربوا لي بسهم)

واتە : (ئەوە نەیزانیوە کە ئەوە پاڕانەوە و پەنایە ئادەی بەشی بکەن و بەشێکم بۆ دابنێن) [1] وە لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا : ئەبا سەعید پەنای دا.

### لە سوودی فەرموودەکە

١) گەڕانەوەی هاوەڵان لە کاتی جیایی وناکۆکی‌دا بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی‌کە حوکمیان بکات ، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ فإن تنازعتم في شيء فردوه إلى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله و اليوم الآخر ذلك خير و احسن تأويلا ﴾ (النساء/٥٩) واتە : (ئەگەر جیایی‌تان تێ کەوت لە هەر شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی ئەگەر باوەڕتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە ئەمە چاکترە بۆتان و ئەنجامەکەشی باشترە) .

وە گێڕانەوە بۆلای خوا بە گێڕانەوە بۆلای قورئان دەبێت ، بەڵام گێڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ بە گێڕانەوە بۆلای خودی پێغەمبەر ﷺ دەبێت لە کاتێکدا کە زیندوە وە گێڕانەوە بۆلای سوننەت و فەرموودەکانی لە دوای کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆلای پەروەردگاری .

---

(١) (رواه البخاري و مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

وە لەو فەرموودەیەدا هاتووە (تركت فيكم ما أن تمسكتم به لن تضلوا بعـــدي أبدا كتـــاب الله و ســـنتي) [١] واتـە : (شتێکم لەناوتاندا بەجێ هێشتووە ئەگەر دەســتی پێـوە بگـرن هـەرگیز گومـڕا نـابن لـە دوای خـۆم قورئانەکـەی خـوا و سوننەتەکەی من) .

٢) دادوەری کردن بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ واجبە لەسەر هاوەڵان و گشت موسوڵمانان .

٣) شیاوی پەنادان بە فاتیحە ، وە بەوەی کە لە سوننەتی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە .

٤) چارەسەری کەسێك کە مار یان دووپشك پێوەی داوە بە خوێندنی فاتیحە و پاڕانەوە بەسەریدا دەبێت ، وە بە دەرمان و گرتنی هۆکان دەبێت ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (يا عباد الله تداووا فإن الله لم يضع داء الا وضع له دواء) [٢]

واتە : (ئەی بەندەکانی خوا چارەسەر بکەن و دەرمان بەکار بهێنن چونکە خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە مەگەر دەرمانیشی بۆ داناوە) .

٥) شیاوێتی کەسی پەنادەر بە وەرگرتنی پاداشت لەسەر پـەنا و پاڕانـەوەی شـەرعی ، چونکە پـەنادەر لە پێشترە بۆ وەرگرتنی پاداشت لە کەسـێکی تـر کـە چارەسـەرێکی مـاددی دەکـات وەکـو دکتـۆر و جگـە لـەو ، وە ئەمـە مانـای ئـەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ (أحق ما أخذتم عليه أجرا كتـاب الله) [٣] واتـە : (چاکـترین پاداشـتێك کـە وەری بگـرن لەسـەر هـەر شـتێك ئـەو پاداشـتەیە کەلەسەر قورئان وەری دەگرن) .

وە مەبەستیش بە فەرموودەکە ئەوە نی یە کە موسوڵمان ئەجر و پاداشت لەسەر خوێندنـی قورئـان وەربگرێـت بـە خوێندنـی لەسـەر مـردووان ، یـان لەسـەر زینـدوو بـەوەی کـە خـەڵك گوێیـان بۆبگـرن لەسـەر خوێدنـی قورئـان و پاداشـتی لەسـەر وەربگرن ، چونکـە ئەمـە پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵانی و پێشـەوا موجتـەهیدەکانیش نەیان کردووە .

---

(١) (صحيح رواه مالك و الحاكم)
(٢) (صحيح رواه أحمد)
(٣) (رواه البخاری)

www.iqra.ahlamontada.com

٦) شیاوێتی پەنادانی موسوڵمان بۆ جگە لە موسوڵمان ، ئەمەش لە گێڕانەوەیەکی (بەزار) دا کە لە جابیرەوە دەیگێڕێتەوە (فقالوا لهم : قد بلغنا أن صاحبكم جاء بالنور و الشفاء ، قالوا : نعم) واتە : (پێی ووتن : پێمان گەیشتووە کە هاوەڵەکەتان ڕووناکی و شیفای هێناوە ، ووتیان : بەڵێ) [1] لەبەر ئەوە ووتیان هاوەڵەکەتان نەیان ووت پێغەمبەری خوا .

## لە سوودەکانی چارەسەر کردن بە سوورەتی فاتیحە

١) ئیبنولقەییم لە پەڕاوی (الجواب الكافي) لە لاپەڕەی سێ‌هەمدا دەڵێت : بەڕاستی ئەم چارەسەر کردنە بە سوورەتی فاتیحە دەورێکی گرنگی‌هەیە لە چاکردنەوە و لابردنی دەردەکەدا ، هەتا ئەو کاتە وابزانرێ دەردەکە هەر نەبووە ، وە بەڕاستی ئەمە ئاسانترین و سادە ترین چارەسەرە ، ئەگەر بەندە چارەسەر بە فاتیحە بکات بە چاکی و بە نیاز پاکی‌یەوە ئەوا دەبینێت کە چەند دەورێکی گرنگ و سەرسوڕهێنەری هەیە لە چارەسەر کردندا .

ماوەیەك لە مەککە مامەوەو دەرمانم دەست نەدەکەوت بەڵێ نە دکتۆرم دەست کەوت و نە دەرمان بەڵام چارەسەری خۆمم بە سورەتی فاتیحە دەکرد ، ئیتر کارێکی گرنگی هەبوو لەسەرم ، وە هەرکەسێك ئازارێ یان دەردێکی هەبووایە بەهەمان شێوەم دەکرد ئیتر زۆرێکیان چاك دەبوونەوە بە خێرایی.

٢) بەڵام لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ئاوڕی لێ بدرێتەوە ، ئەویش ئەوەیە کە ئەو زیکر و ئایەت و پاڕانەوانە کە بۆ چارەسەر کردن بەکار دەهێنرێ ، خودی خۆی سوود دار و چاکە ، بەڵام ئەمانە لەسەر توانا و هیممەتی بێژەرەکانیان وەستاوە ، وە هەرکاتێك چارەسەرەکە لاواز بوو کاری نەبوو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی باوەڕ و لە خواترسانی بێژەرەکەی یان بەهۆی نەهێڵەرێکی بەهێزەوە کە ناهێڵێت چارەسەرەکە سوودی هەبێت ، وەکو چۆن لە دەرمانە هەست پێ کراوەکاندا دەبینرێ ، کە نەبوونی کارتێکردنی ئەو دەرمانە بەهۆی ئەوەوەیە کە

---

(١) (سەیری فتح الباري بکە)

www.iqra.ahlamontada.com

سروشتی ئەو کەسە واتە لاشەی ئەو دەرمانە وەرناگرێت و قوبوڵی ناکات بەهۆی ئەهێڵەرێکی بەهێزەوە کە ناهێڵێت دەرمانەکە سوودی هەبێت ، چونکە سروشتی مرۆڤ ئەگەر ئەم دەرمانەی وەرگرت بەوەرگرتنێکی تەواو سوودی بۆ لاشە بەپێی ئەم وەرگرتنە دەبێت ، بە هەمان شێوە دڵیش ئەم دوعا و پاڕانەوە و پەنایانەی بە وەرگرتنێکی تەواو وەرگرت ئەوا بێژەر و بکەرەکەی دەرونێکی کارکەریان هەیە ، وە توانایەکی بەهێزیشیان هەیە بۆ لابردنی دەردەکە.

## فەرموودەی سێیەم :

لە ئیبنوعەباسەوە ﷺ دەفەرموێت : پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جوبرەئیلدا بوو لە پڕێکدا گوێی لە دەنگێك بوو لە سەرو خۆیەوە، ئیتر جوبرەئیل چاوی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و ووتی : ئەوە دەرگایەك بوو لە ئاسمان کرایەوە کە تا ئێستا نەکراوەتەوە ، دەڵێت : فریشتەیەکی لێ هاتە خوارەوە و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ووتی : مژدە بدە بەدوو ڕووناکی کە پێت دراوە ، وە لە پێش تۆدا نەدراوە بە هیچ کەسێکی تر کە بریتین لە : سورەتی فاتیحە و کۆتایی سورەتی بەقەرە ، هیچ حەرفێکی نەخوێندراوە مەگەر بە تۆ دراوە [1] .

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە

١) هاتنە خوارەوەی جوبرەئیل عليه السلام و هاتنی بۆلای پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار .
٢) هاتنی دەنگێك لە ئاسمان بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی شتێکی گرنگ.
٣) ئاسمان دەرگایەکی هەیە هەرگیز مەگەر نەکراوەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ نەبێت ، وە هاتنە خوارەوەی فریشتەیەك لێی ڕێز وگەورەیی‌یەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ .
٤) فریشتەکە مژدەی دا بە پێغەمبەر ﷺ بە دوو ڕووناکی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە و نەیبەخشیوە بە هیچ پێغەمبەرێك پێش پێغەمبەر ﷺ .

وە دوو ڕووناکی‌یەکە بریتین لە : سورەتی فاتیحە و کۆتایی سورەتی بەقەرە کە دوو ئایەتی کۆتایی سەرەتەکەیە کە لە ﴿ لا يكلف الله نفسا إلا وسعها ....... هەتا ..... فانصرنا على القوم الكافرين ﴾ (البقرة/٢٨٦)

---

(١) (موسلیم و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە)

www.iqra.ahlamontada.com

# شوێنەکانی پەنا گرتن و گەورەیی یەکەی

١) **لە کاتی خوێندنی قورئاندا** : لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ فإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم ﴾ (النحل/٩٨)

واتە کاتێ کە قورئانت خوێند پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو ، (واتە لە پێش خوێندنی قورئاندا کە دەڵێیت : ((أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)).

٢) **پێغەمبەر ﷺ کە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ** دەیفەرموو : (أعوذ بالله السـميع العليم من الشيطان الرجيم من همزه و نفخه و نفثه) [١]

همزه : جۆرێکە لە شێتی .

نفخه : واتە : خۆ بەگەورە گرییەکەی .

نفثه : واتە : شیعری خراپ

وە شیاوە جگە لەمەش وەکو (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) .

٣- **لە کاتی تووڕەیدا** : لە سولەیمانی کوڕی صەردەوە ﷺ دەڵێ : دوو پیاو لەلای پێغەمبەردا ﷺ بوو بە دەمە قاڵەیان وە ئێمەش لەلای پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین ، یەکێکیان جنێوی بە هاوەڵەکەی داو لێی تووڕە بوو چاوی سوور هەڵگەڕا ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : من ووشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێت ئەوەی کە تووشی بووە لەو توڕەییە لە کۆڵی دەبێتەوە و دادەمرکێتەوە کە ئەریش (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) ە .... فەرموودەکە.

٤) **لەکاتی چوونە سەرئاودا** : لە ئەنەسەوە دەفەرموێ : پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە دەچووە سەر ئاو دەیفەرموو : (اللهم إني أعوذ بك من الخبث و الخبائث)

واتە : (خوایە پەنات پێ دەگرم لە شەیتانی نێر و مێ) .

---

(١) (صحيح رواه أحمد و غيره)

www.iqra.ahlamontada.com

٥) **لە کاتی وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێ درێژدا** : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (إذا سمعتم نباح الكلاب و نهيق الحمير بالليل ، فتعوذوا بالله من الشيطان الرجيم فإنهن يرين مالا ترون) [١] واتە : (ئەگەر لە شەودا گوێتان لە وەڕەی سەگ و زەڕەی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بە خوای گەورە لە شەیتانی نەفرین لێ کراو ، چونکە ئەوانە شەیتان دەبینن کە ئێوە نایبینن) .

٦) **لەکاتی خەو لێ نەکەوتن و ترساندا** : پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی فێردەکرد کە لەو کاتانەدا بڵێن : (أعوذ بكلمات الله التامة من غضبه و عقابه ، و شر عباده ، و من همزات الشياطين و ان يحضرون) [٢]. واتە : (پەنا بە خوا دەگرم بە ووشە تەواوو پڕ ماناکانی لە توڕەیی و سزای خوای گەورە وە لە خراپە و شەڕی بەندەکانی ، وە لە شێتی و خراپەو وەسوەسەی شەیتانەکان کاتێك کە ئامادەن و دێنە لام) .

٧) **لە کاتی پاڕانەوەدا** : پێغەمبەر ﷺ پەنای حەسەن و حوسەینی دەدا و دەیفەرموو: (اعيذكما بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة و من كل عين لامة) [٣] ، واتە : (پەناتان دەدەم بە خوای گەورە بە ووشە تەواو و پڕ ماناکانی لە هەموو شەیتانێك و خاوەن ژەهرێك وە لە هەموو چاوێکی پیس) .

٨) **لە کاتی چوونە ناو مزگەوتەوە** : پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە دەچووە مزگەوت دەیفەرموو : (أعوذ بالله العظيم ، و بوجهه الكريم ، و سلطانه القديم من الشيطان الرجيم) . واتە : (پەنا بە خوای گەورە و باڵا دەست دەگرم ، وە بە ڕووی پاك و بێگەرد و بەڕێزی ، وە بەدەسەڵاتی هەر بوویی هەتا هەتایی لە شەیتانی نەفرین لێ کراو .

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەرکاتێك بەندە ئەمەی ووت ، شەیتان دەڵێت : ئەم بەندەیەقەدەغە بوو لە من بە درێژایی ئەمڕۆ [٤] .

---

(١) (صحيح رواه أحمد و غيره)
(٢) (صحيح رواه أبو داود و الترمذي) .
(٣) (رواه البخاري)
(٤) (صحيح رواه ابو داود)

www.iqra.ahlamontada.com

## مانای پەنا گرتن

مانای (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ئەوەیە : پەنا بە خوای گەورە و بالا دەست دەگرم لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو کە زەرەرم پێ بگەیەنێت لە دین و دونیام ، یان لام بدات لەو کارانەی کە فەرمانم پێ کراوە ، یان هانم بدات لەسەر ئەو کارانەی کە فەرمانم پێ کراوە بە نەکردنی چونکە هیچ شتێك شەیتان دوور ناخاتەوە لە مرۆڤ مەگەر خوای گەورە نەبێت ، وە لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پەنا گرتن لە شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە ...

وە (الشیطان) لەزمانی عەرەبیدا ورگیراوە لە (شطن) کاتێك دوور بکەوێتەوە ، چونکە شەیتان دوورە لە سروشتی مرۆڤەوە ، وە دوورە بە لە سنوور دەرچوییەکەی لە هەموو چاکەیەك .

سیبەوەیهی دەڵێت : عەرەب دەڵێن : ((تشیطن فلان)) کاتێك کە یەکێك کارێك بکات وەك کاری شەیتانەکان وابێت ، وە (الشیطان) وەرگیراوە لە دووریەوە لە ڕاستیدا وە لەبەر ئەمەیە کە هەموو کەسێك کە دوور کەوێتەوە لە مرۆڤ یان جنۆکە یان حەیوان پێی دەڵێن (شیطان) .

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ وكذلك جعلنا لكل نبي عدوا شيطين الإنس و الجن يوحي بعضهم إلى بعض زخرف القول غرورا ﴾ (الأنعام/١١٢) .

واتە: (وە ئاوا لە ڕاست هەر پێغەمبەرێکدا دوژمنێکمان لە شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە دانا کە قسەی فریو دەر و بێبنەڕەت بە سرتە و بە نهێنی بە یەکتر دەگەیەنن) [١] .

---

(١) (سەیری تەفسیری (إبن كثير) بکە ١/٢٥-٢٦)

www.iqra.ahlamontada.com

# شوێنەکانی وتنی (بسم الله) و گەورەیی یەکەی

## ١) لە کاتی دەست نوێژدا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (لا صلاة لمن لا وضوء له ، ولا وضوء لمن لم يذكر إسم الله عليه) [1] واتە : (نوێژی هیچ کەس دروست نی‌یە هەتا دەستنوێژی نەبێت ، وە دەست نوێژی هیچ کەس دروست نی‌یە هەتا ((بسم الله) ی لەسەر نەکات) .

## ٢) لە کاتی سەربڕین و ڕاوکردنی نێچیردا

ا- خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ ولا تأكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه و أنه لفسق ﴾ (الأنعام/١٢١) واتە : (لەو سەربڕاوو نێچیرەی کە ناوی خوای لەسەر نەبراوە مەخۆن چونکە بەڕاستی ئەوە گوناهو لە سنوور دەرچوونە) .

ب- وە خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ فكلوا مما امسكن عليكم و اذكروا إسم الله عليه ﴾ (المائدة/٤) واتە : (وە بخۆن لەو نێچیرەی کە سەگەکانتان بۆتان دەگرن وە ناوی خوای لەسەر بهێنن) .

ج- عدی کوڕی حاتم الطائی پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەی حوکمی ڕاو کردن بە سەگ کاتێك کەلەگەڵ سەگەکەی‌دا سەگێکی تر پەیدا بوو نەدەزانرا کامەیان ڕاوی کردووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (لا تأكل ، فإنما سميت على كلبك و لم تسم على غيره) [2] واتە : (مەیخۆ چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت بردووە و لەسەر جگە لەوت نەبردووە) .

## ٣) لەکاتی دەست پێ کردنی خواردن و خواردنەوەدا

عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە دەفەرموێ : من منداڵێك بووم لە ژوورەکەی پێغەمبەر ﷺ دا وە دەستم بەم لاولای قاپە خواردنەکەدا دەگێڕا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (يا غلام سم الله ، و كل بيمينك ، و كل مما يليك)

---

(١) (رواه أحمد و أصحاب السنن الا النسائي و قال إبن كثير : إنه حديث حسن)

(٢) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (ئەی منداڵ ناوی خوا بەرە ، وە بەدەستی ڕاستت بخۆ ، وە لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ) .

## ٤) بۆ چارەسەرکردن لە ئازار و نەخۆشی

ا- عوسمانی کوڕی ئەبی عاص شکاتی بردە لای پێغەمبەر ﷺ کە ئازارێکی لێ پەیدا بووە هەر لەو ڕۆژەوەی کە موسوڵمان بووە ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (ضع يدك على الذي تألم من جسدك ، و قل بسم الله ثلاثا ، و قل سبع مــــرات ، أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد و أحاذر) [1]

واتە: (دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی کە ئازاری هەیە لە لەشتدا وە بڵێ ((بسم الله)) سێ جار ، و حەوت جار بڵێ ((أعوذ بالله و قدرته من شر ما أجد و أحاذر)) واتە پەنا بە خوا و بە دەسەڵاتی دەگرم لە زیانی ئەوەی کە هەستی پێ دەکەم و لێی دەترسم) .

ب- لە ئەبی سەعیدی خودریەوە دەفەرموێ : جوبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی : ئەی محەممەد هەست بە ئازارو نەخۆشی دەکەیت؟ فەرمووی : بەڵێ ، فەرمووی : (بسم الله ارقيك من كل شيء يؤذيك ، من شر كل نفــــس ، او عين حاسد ، الله يشفيك باسم الله ارقيك) [2] واتە : (بەناوی خوای گەورە پەنات دەدەم لە هەموو شتێك كە زیان و ئازارت پێ بگەیەنێت ، وە لە زیانی هەموو دەروونێك و هەموو كەسێك ، یان هەموو چاوێكی پیس و حەسود ، خوای گەورە چارەسەرت كات ، بەناوی خوای گەورە پەنات دەدەم) .

## ٥) لەکاتی چوونە ناو مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی

لە ئەنەسەوە دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ کە دەچووە مزگەوت دەیفەرموو : (بســــم الله اللهم صل على محمد اللهم افتح لي أبواب رحمتك ) واتە : بەناوی خوا خوایە دەرگای بەزەیی خۆتم لێ بکەرەوە ، وە کە دەچووە دەرەوە دەیفەرموو (بســــم الله اللهم صل على محمد اللهم افتح لي أبواب فضلك)[3]

---

(١) (رواه مسلم وغيره) (٢) (رواه مسلم)
(٣) (حسن رواه ابن السني)

www.iqra.ahlamontada.com

## ٦ ) لەکاتی کۆبوونەوەی پیاو لەگەڵ خێزانەکەیدا

لە ئیبنوعەباسەوە دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ئەگەر یەکێکتان ویستی لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا کۆبێتەوە و ووتی : (بسم الله ، اللهم جنبنا الشـيطان ، و جنب الشيطان ما رزقتنا ، فانه ان يقدر بينهما ولد في ذلك لم يضره الشيطان أبـدا) [١]
واتە: (بەناوی خوا ، خوایە دوورمان خەرەوە لە شەیتان ، وە شەیتان دوور خەرەوە لەو ڕۆزییەی (منداڵەی) کەپێمان دەبەخشیت ، خۆ ئەگەر خوای گەورە منداڵێکی دانێ هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێ) .

## ٧ ) هەموو ئێوارەو بەیانییەك

عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : هەر بەندەیەك لە بەیانی و ئێوارەی هەموو ڕۆژێکدا بڵێت ((بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شـيء في الأرض ولا في السماء و هو السميع العليم))

واتە : (بەناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ووتنی ناوی ئەودا هیچ شتێك ناتوانێت زیان بگەیەنێت نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا وە هەر ئەو بیسەر و زانایە) سێ جار بیڵێت هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت [٢]

## ٨ ) لەکاتی داخستنی دەرگای ماڵ لە شەودا

لە جابیری کوڕە عەبدوڵلاوە دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : کاتێك کە شەو داهات و ئێوارەتان کرد منداڵەکانتان بگرنەوە ، وە کاتێك کە سەعاتێك لە شەو ڕۆیشت وازیان لێ بهێنن ، وە دەرگا دابخەن وە ناوی خوای لەسەر بەرن چونکە شەیتان دەرگایەك ناکاتەوە کە داخرابێت و ناوی خوای لەسەر برابێت ، وە سەری مەشکە و سەتڵی ئاو قایم بکەن و ناوی خوای لەسەر بەرن ، وە سەری قاپ و قاچاخێك کە خواردنی تێدایە بنێنەوە ئەگەر شتێکیشتان داوە بەسەریدا ، وە گڵۆپ و چراو ئاگرتان بکوژێننەوە [٣] .

---

(١) (متفق عليه)
(٢) (رواه أبوداود و الترمذى و الحاكم و صححه و وافقه الذهبى)
(٣) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

## ٩ ) لەکاتی چوونە دەرەوە لەماڵ و هاتنەوەدا

ا- لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ئەگەر پیاو لە ماڵەکەی چووە دەرەوەو ووتی ((بسم الله توكلت على الله ، لا حول ولا قوة إلا بالله)) پێی دەوترێت ڕێنموونی کرایت ، وە ئەوەندە بەسە بۆت وە پارێزراوی وە شەیتانیش مل کەچ دەبێت بۆی [1] .

ب- لە جابیری‌کوڕی عەبدوڵلاوە دەفەرموێ لە پێغەمبەرم ﷺ بیست کە فەرمووی : ئەگەر پیاو چووە ماڵەکەی و ناوی خوای برد لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا و لەکاتی خواردندا ، شەیتان دەڵێت شوێنی مانەوەتان نی‌یە و خواردنیشتان نی‌یە بۆ من ، وە ئەگەر چووە ژوورەوە بەلام ناوی خوای نەهێنا لەکاتی چوونە ژوورەوەیدا شەیتان دەڵێت شوێنی مانەوەم بۆ خۆم دەستگیر کرد ، وە ئەگەر ناوی خوای نەهێنا لەکاتی خواردنەکەیدا شەیتان دەڵێت : شوێنی مانەوە و خواردنیشم بۆ خۆم دەستگیر کرد [2] .

## ١٠ ) لەکاتی سوار بوونی ووڵاخ یان ئوتومبێل یان فڕۆکە یان کەشتی‌دا

پێغەمبەر ﷺ کە سواری ووڵاخێك دەبوو دەیفەرموو : (بسم الله الحمد لله ﴿ سبحان الذي سخر لنا هذا و ما كنا له مقرنين ﴾) (الزخرف/١٣) (رواه مسلم)
واتە: (بەناوی خوا ، سوپاس بۆ خوا ، پاك و بێ گەردە ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ڕام کردین کە کە ئێمە توانای ئەمەمان نەبوو) .

## ١١ ) وە ( بسم الله ) لە دوو شوێندا هەموو کات بەکار دەهێنرێت

ا- لەکاتی خوێندنی قورئاندا کە دەڵێت (بسم الله الرحمن الرحيم) لە سەرەتای سورەتەکاندا ، ئیتر لە نوێژدا بێت یان لە دەرەوەی نوێژ.

ب- لەکاتی نووسینی نامەدا وە بەڵگەش خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ إنه من سليمن و انه بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ (النمل/٣٠)

---

(١) (صحيح رواه أبوداود)

(٢) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (ئەم نامەیە لەلایەن سولەیمانەوە ئاراستە کراوە و بەم جۆرەیە : بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان) .

وە هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ نامەکەیی پێ دەست پێ کرد کە بۆ هیرەقلی پاشای ڕۆمی ئاراستە کرد :

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبانەوە : لە موحەممەد پێغەمبەری خوا بۆ هیرەقل پاشای ڕۆم ، سەلام لەسەر ئەو کەسە بێت کە شوێن ڕێگای ڕاست دەکەوێت ، ئینجا لە دوای ئەوە موسوڵمان ببە دەپارێزرێی و خوای گەورە دووجار پاداشتەکەت دەداتەوە) [1] .

## مانای بسم الله

ئیبنو کثیر دەڵێ : ((بسم الله) ئەم ووشەیە (إسم) یان (فعل) ە وە ئەم دووانەش لە یەکەوە نزیکن ، وە هەردوکیان بەڵگەی قورئانیان لەسەرە ، سەبارەت بەو کەسەی کە بە (إسم) ی دادەنێ تەقدیرەکەی (بسم الله إبتدائي) یە واتە بەناوی خواوە دەست پێ دەکەم لە سەرەتاوە ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و قال اركبوا فيها بسم الله مجريها و موسها آن ربي لغفور رحيم ﴾ (هود/٤١) .

واتە : (وە نوح ووتی بە ناوی خوا سواری کەشتییەکە بن وە لە کاتی ڕۆیشتن و وەستانیدا ناوی خوا بەرن بەڕاستی پەروەردگارم لێ خۆش بوو بەبەزەییە) .

وە ئەوەشی کە بە(فعل)ی دادەنێ لەبەر ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ اقرأ باسم ربك الذي خلق ﴾ واتە : (بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە دونیای دروست کردووە) .

وە هەردوکیشیان ڕاستە ، چونکە (فعل) هەر دەبێت سەرچاوە (مصدر)ی هەبێت وە تۆ دەتوانی تەقدیری فعلەکە بکەیت و هی مەصدەرەکەشی ، وە ئەمەش بە پێی ئەو فعلەی کە لە پێشیەوە ناوی دەبەیت ، ئیتر ئەگەر خواردن بێت یان خواردنەوە یان خوێندنەوە یان دەست نوێژ یان نوێژ بێت .

---

(١) (رواه البخاري)

www.iqra.ahlamontada.com

کە بردنی ناوی خواش لە هەموو ئەم شوێنانەدا شیاوەو مەشروعە ، ئیتر ئەگەر بۆ پیرۆزی بێت یان دەست پێکردن بێت یان بۆ یارمەتی وەرگرتن و تەواویی کارەکە خوای گەورەش باشتر دەزانێت .

(الله) ناوێکی (عەلەمە) بۆ پەروەدگاری بەرز و بڵند وە دەشووترێت (الله) ناوی گەورەیە ، چونکە بە هەموو سیفاتەکان وەسفی دەکرێت ، وەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ هو الله الذي لا إله إلا هو عالم الغيب و الشهادة ، هو الرحمن الرحيم ، هو الله الذي لا إله إلا هو الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبار المتكبر سبحان الله عما يشركون ، هو الله الخالق الباريء المصور له الأسماء الحسنى يسبح له مافي السماوات و الأرض و هو العزيز الحكيم ﴾

واتە : ئەوە ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نی‌یە جگە لەو وە هەر ئەو زانایە بە نهێنی و ئاشکرا کە بەبەزەیی و میهرەبانە ، وە ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نی‌یە جگە لەو کە پاشایە ، پیرۆز و بە پیرۆز گیراوە وە ئاشتی‌یە وە ئاسایش دەرە ، بە دەسەڵات و بەتوانایە زاڵەو خاوەن شکۆیە وە هەر ئەو شیاوی گەورەیی‌یە ، پاك و بێ گەردە لەو هاوەڵانەی کە بۆی بڕیار دەدەن ، ئەوە خوای دروستکەر و بێ وێنەیە ، دیمەن دەرە وە هەر بۆ ئەوە ناوی جوان و چاك و شیاو ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە پاك و بێگەردی ئەو دەڵێن وە هەر ئەو بە توانا و بە دەسەڵات و دانایە) .

بەڵی‌هەموو ناوەکان دەکات بەسیفات بو (الله) ، وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ و لله الأسماء الحسنى فادعوه بها ﴾ واتە : (هەربۆ (الله) یە خوای گەورەیە ناوە جوانەکان دە پێی بپاڕێنەوە) [١]

وە ئەبو هورەیرە دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( ان الله تسعةو تسعين إسما ، مائة إلا واحدا ، من أحصاهادخل الجنة) [٢]

---

(١) (تفسير إبن كثير)

(٢) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (خوای گەورە نەوەد و نۆ ناوی هەیە ، سەد ناو مەگەر یەك ناوە نەبێت ، هەرکەسێك تێ بگات لێیان دەچێتە بەهەشتەوە) .

وە مانای (احصاها) بریتی‌یە لەوەی لە ماناکەی تێ بگات بە تێگەیشتنێکی تەواو ، وە کاریان پێ بکات بە حەقەکان ، وە حەقەکەشی ئەوەیە یەکخواپەرست بێت بە یەکخواپەرستی خودی خوا ، وە یەکخواپەرستی سیفات ، و یەکخواپەرستی پەرستراوێتی ، وە یەکخواپەرستی پەروەردگارێتی لە هەمو شوێن و لایەکدا وەلە هەموو ئەندامەکانیدا ، وە دەربڕینی لە دەروونیدا ، ئینجا ئەگەر لەسەر ئەم یەکخواپەرستی‌یە پاکەمرد بەبێ ئەوە کە هیچی تری تێکەڵاو بکات لە هەر مانایەك لە ماناکانی‌دا ، وە کردارێکی وای نەبێت کە پووچی بکاتەوە لە گوفتارو و بیر و باوەڕدا دەچێتە بەهەشتەوە ، بەڵام تێگەیشتن لە مانای (إحصاها) بە لەبەر کردنێکی بێ ئاگا ، زۆرێك لە خەڵك هەن کە لەبەریان کردووە و دڵیان بێ ئاگایە لێی وە بەخێرایی دووبارەیان دەکەنەوە بەبێ ئەوەی لە ماناکانی تێ بگەن ، وە کردارێکی وایان هەیە کە پووچیان دەکاتەوە ئەوە ئەو پووچ کردنەوەیە پووچ کردنەوەی ووتنەکانیانە ، وە نمونەی ئەم کەسانە بەر (احصاها) ناکەون چونکە مەبەست هیچ نی‌یە لەم ووشەیە مەگەر تێگەیشتن و دڵسۆزی‌نەبێت [1] .

## بسم الله الرحمن الرحيم

لە ئیبنوعەباسەوە رضي الله عنه (أن رسول الله ﷺ كان لا يعرف فضل السورة حتى ينزل عليه ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾) [2] واتە : (پێغەمبەر ﷺ نێوانی دوو سورەتی نەدەزانی هەتا ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ دەهاتە خوارەوە)

وەزانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ بەشێکە لە ئایەتێکی سوورەتی (النمل) ئینجا زانایان جیان لەوەی کە ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ ئایەتێکی سەربەخۆیە لە سەرەتای سورەتەکاندا یان تەنها لە فاتیحەدا ئایەتێکی سەربەخۆیە ، یان لە جیاکردنەوەی سورەتەکاندا لە یەکتری ، بەڵام بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە بۆ جیاکردنەوەی نێوانی سوورەتەکانە ، وەکو چۆن ئێستا

(١) (تعليق الرفاعى) (٢) (صحيح رواه أبوداود)

www.iqra.ahlamontada.com

باسمان کرد لە ووتەکەی ئیبنو عەبباسەوە ﷺ کە ئەبو داود گێڕاویەتیەوە ، وە ئەوەی کە دەڵێت ئایەتێکەلە سوورەتی فاتیحە وا دەبینێ کە دەنگی پێ بەرز بکرێتەوە لەنوێژە جەماعەتە دەنگ بەرزەکاندا ، وەئەوانەی کە وای دانانێن وای دەبینن کە بە بێدەنگی بووترێ ، وە بۆ هەر یەکێك لە دوو بۆچوونەکە کۆمەڵێك لە هاوەڵان هەیە کە وای بۆ دەچن.

وە ئەوەی کە جێگیرە لە چوار جێ نشینەکەوە ئەوان بە دەنگی نزم ووتویانە ، وە بەهەمان شێوە کۆمەڵێك لە پێشینی شوێن کەوتووان و دواکەوتوان وە ئەمە مەزهەبی ئەبی حەنیفە و ثەوری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە.

وە کورتەی قسە : کۆی ئوممەتی لەسەر ە لەسەر ڕاستێتی ئەوەی کە بە دەنگی بەرز دەیلێت و ئەوەشی کە بە دەنگی نزم دەیلێت [1] .

## لە ڕێنمونی ئایەتەکە

١- ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ بەشێکە لە ئایەتێکی سوورەتی (النمل) .

٢- ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ بۆ جیاکردنەوەی نێوان سوورەتەکانە .

٣- ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ یەکەمین ئایەتە لە سورەتی فاتیحە.

ا- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (الحمد لله رب العالمين أم القرآن ، أم الكتـــاب و السبع المثاني ...) [2] ﴿ و لقد آتينك سبعا من المثاني و القرآن العظيم ﴾ (الحجر/٨٧)

ب- لە ئوممو سەلەمەوە ( أن النبي ﷺ قرأ الفاتحة ، وعد البسملة آية منها) [3]

واتە : (پێغەمبەر ﷺ سورەتی فاتیحەی خوێند ، ((بسم الله الرحمن الرحيم)) ی بە ئایەتێکی سوورەتەکە لەقەڵەم دا) .

---

(١) (سەیری -مختصر إبن كثير- بکە هی ڕەفاعی)

(٢) (صحيح رواه الترمذي)

(٣) (صحيح رواه ابن خزيمة)

www.iqra.ahlamontada.com

# الحمد لله رب العالمين

(الحمد لله) واتە : سوپاسی تەواو بۆ خوای گەورە جگە لە هەموو ئەوانەی کە بێجگە لە خوا دەپەرسترێن ، وە بێجگە لە هەموو ئەو کەسانەی کە خوای گەورە دروستی کردوون و نیعمەتی خۆی پێ داون کە لە ژماردن نایەت ، وە کەسیش توانای نییە کە پەی ببات بە ژماردنیان بێ ئەوەش هەتا هەتایە بتوانن ئەم وەڵامە بدەنەوە و ئەم کارە ئەنجام بدەن ، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و بەدەسەڵات لە سەرەتاو کۆتاییدا .

وە ئەو ئەلف و لامەی (الحمد) بۆ کۆکردنەوەی هەموو جۆرەکانی سوپاسەو ئاراستە کردنی هەر هەموویەتی بۆ خوای گەورە و بەدەسەڵات : وەکو چۆن لەو فەرموودەیەدا هاتووە: (اللهم لك الحمد كله و لك الملك كله ، و بيدك الخير كله ، و إليك يرجع الأمر كله) [1] .

واتە : (خوایە هەرچی سوپاسم هەیە هەر بۆ تۆیە ، وە هەموو موڵك و ماڵی دونیا هەر هی تۆیە ، وەهەر بە دەستی تۆیە گشت چاکەیەك ، وە هەموو فەرمان و کارێك هەر بۆلای تۆ دەگەڕێتەوە .

﴿ رب العالمين ﴾ (الرب) (پەروەردگار) واتە : پاشای بەدەسەڵاتی هەڵسوڕێنەر وە ناوترێ (الرب) بە ئەلف و لامەوە واتە بەناسراوی مەگەر بە خوای گەورە نەبێت ، وە جائیز نییە بەکارهێنانی ووشەی (الرب) بۆ جگە لە خوا مەگەر بە (اضافة) پاڵدان نەبێت کە دەڵێین (رب الدار) واتە خاوەنی ماڵ ، یان (رب السيف) واتە خاوەنی شمشێرەکە ، بەڵام (رب) بە ئەلف و لامەوە ناوترێت مەگەر بە خوای گەورە نەبێت .

(العالمين) (هەموو جیهان)، وە ئەمەش هەموو شتێکی هەبوو دەگرێتەوە جگە لە خوای باڵا دەست و کاربەجێ ، وە ووشەی(العالم) (جیهان) ووشەیەکی کۆیە و تاکی نییە لە لەفزدا، وە (العوالم) جۆری دروست کراوەکانە لە ئاسمانەکان و زەویدا و لە ووشکانی و لە دەریادا ، کەواتە مرۆڤ جیهانێکن ، جنۆکە جیهانێکن ، فریشتەش جیهانێکن ....

---

(١) ( -إبن كثير- هێناویەتی و (شێخ موقبیلی وادعی) ش بەلاوازی دادەنێ)

www.iqra.ahlamontada.com

وە بەم شێوەیە بیشری كوڕی عەممارە بە سەنەدەكەی لە ئیبنوعەباسەو دەگێڕێتەوە كە :

﴿ الحمد لله رب العالمين ﴾ سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە هیئەوە هەرچی دروستكراوە لە ئاسمانەكان و زەویدا وە ئەوەی تیایاندایە وە ئەوەی كە لە نێوانیاندایە وە ئەوەی كە دەیان زانین و ئەوەشی كە نایان زانین .

وە ئیبنوجەریر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت : ((الحمد لله)) سوپاسێكە خوای گەورە سوپاسی خۆیی پێ كردووە ، لە ژێر تیشكیدا فەرمانی كردووە سوپاسی بكەن ، وەكو ئەوە وایە كە ووتبێتی بڵێن (الحمد لله) .

دەڵێت : وە ووتراویشە : مبەست بە (الحمد لله) سوپاس بۆ خوا بە ناوو سیفاتە جوانەكانی وە كە دەفەرموێ (الشكر لله) سوپاس بۆ خوا بە نیعمەتەكانی و هەموو چاكەكانی كە بەخشیویەتی .

## لە ڕێنموونی ئایەتەكە

١- ((الحمد)) بە تەنها ئاراستەی خوای گەورە دەكرێ ، و ئاراستەی كەسی تر ناكرێ ، چونكە خوای گەورە پەروەردگاری هەموو جیهانە .

٢- بەلام ((الشكر)) ئاراستەی خوای گەورە وجگە لەویش دەكرێ ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ان اشكر لي و لو لديك إلى المصير ﴾ (لقمان/١٤)

واتە : (سوپاسی من و باوك و دایكت بكە وە هەر بۆلای منە گەڕانەوە) .

٣- لەئایەتەكەدا یەكخواپەرستی پەروەردگارێتی تێدایە كە هاوەڵ پەیداكەرەكایش دانیان پیادا دەنا ، خوای گەورە دەفەرموێ سەبارەت بەهاوەڵ پەیدا كەرەكان ﴿ قل من رب السماوات السبع و رب العرش العظيم ، سيقولون لله قل أفلا تتقون ، قل من بيده ملكوت كل شيء وهو يجير ولا يجار عليه إن كنتم تعلمون ، سيقولون لله قل فأنى تسحرون ﴾ (المؤمنون/ ٨٦-٨٩)

واتە : (بلێ كێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكەو عەرشی گەورەیە ، دەڵێن خوای گەورە ، بلێ ئەی كێ فەرمانڕەوایی هەموو شتێكی بەدەستە وە ئەو خوایە

www.iqra.ahlamontada.com

پەنا دەدات و پەنا نادرێ ئەگەر بزانن ، ئەڵێن خوای گەورە ، بڵێ ئەی ئیتر چۆن جادووتان لێ کراوە) .

بەڵێ هاوەڵ پەیدا کەرەکان دانیان بەوەدا دەنا کە خوای گەورە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکە و زەوی یەو پەروەردگاری عەرشی گەورەیە ، وەکو چۆن دانیان بەوەدا دەنا کە پەروەردگار دروست کەریانە ، بەڵام لەم دان پیادانانە سوودیان وەرنەگرت ، چونکە هاوەڵیان بۆ پەیدا کرد لە کاتێکدا پاڕانەوەو بەندایەتی یان بۆ جگە لە خوا دەکرد.

## گەورەیی ( الحمد لله ) و شوێنەکانی

١- لە دوای خواردن و خواردنەوە : لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ

ا- ( إن الله ليرضى عن العبد أن يأكل الأكلة فيحمده عليها ، أو يشرب الشربة فيحمده عليها) [1] واتە : (خوای گەورە لە یەکێك ڕازی دەبێت کە خواردنێك دەخوات سوپاسی خوای لەسەر دەکات ، وە کە خواردنەوەیەك دەخواتەوە سوپاسی خوای لەسەر دەکات ) .

ب- وە دەفەرموێ (من اكل طعاما فقال : الحمد لله الذي اطعمني هذا و رزقنيه من غير حول مني ولا قوة ، غفر له ما تقدم من ذنبه) [2] واتە: (هەرکەسێك خواردنێك بخوات و بڵێ : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی دەرخوارد دام بەبێ ئەوەی بە هەوڵ و توانای من بێت ، خوای گەورە لە گوناهی لەوەوپێشی خۆش دەبێت) .

٢- لەکاتی نوستندا : لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێ :

ا- پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە دەچووە سەر جێگاکەی دەیفەرموو: (الحمد لله الذي اطعمنا و سقانا و كفانا و آوانا ، فكم ممن لا كافي له ولا مؤوي) [3] .

---

(١) (رواه مسلم و غيره)

(٢) (صحيح رواه الترمذي و غيره)

(٣) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (سوپاس بۆ ئەوخوایەی کە خوادرنی داین و تێر ئاوی کردین وە بەشی کردین و نیشتەجێی کردین ، چەند کەس هەیە کە نەئەوەندەی هەیە بەشی بکات و نەشوێنی نیشتەجێی هەیە و کە لێی نیشتەجێ ببێت) .

ب- فاطمە لە عەلیەوە (خوا لێی ڕازی بێت)دەفەرموێت : شکاتی کرد کە چەند دەستی گیراوە و سەرقاڵە ، ئەوەبوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بەندەیەکدا بەڵام بەندەکە ڕۆیشت و نەیدۆزیەوە ئەوەبوو عائشەی بینی و هەواڵی دانێ ، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ هاتەوە عائیشە هەواڵی پێدا بە هاتنی من وە لەو کاتەدا چووبوینە سەر جێگای نوستنمان ویستم هەستم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لە شوێنیخۆتاندا بمێننەوە ئەوەبوو لە نێوانماندا دانیشت هەتا ئەوکاتەی هەستم بە ساردی پێکانی کرد بەسەر سنگمەوە فەرمووی (ئایا شتێکتان فێر بکەم لەوە چاکتر بێت کە پرسیارتان کرد لەبارەیەوە ؟ کاتێك کە چوونە سەر جێگای نوستنتان سیو چوار (الله اکبر) بکەن وە سی و سێ (سبحان الله) وە سی و سێ (الحمد لله) ش بکەن ئەمە چاکترە بۆتان لە خزمەتکارێك[1] وە شیاویشە کە لە پێش نوستنیشدا بوترێت (سبحان الله ٣٣) وە (الحمد لله ٣٣) وە (الله اکبر ٣٤) جار .

٣- لەکاتی هەستان لەخەو : لە حوزەیفەوە ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ کە دەچووە سەر جێگاکەی لە شەودا دەسی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی و دەیفەرموو (باسمك اللهم احیا و اموت) واتە (خوایە بەناوی تۆ زیندو دەبمەوە و دەمرم) . وە کاتێك هەڵدەستا لە خەو دەیفەرموو (الحمد لله الذي أحیانا بعد ما أماتنا و إیه النشور) [2] واتە : (سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە زیندووی کردینەوە لە دوای ئەوەی کە مردبووین وەهەر بۆلای ئەوە گەڕانەوە ) .

٤- لەکاتی پژمیندا : لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (کاتێك کە یەکێکتان پژمی با بڵێ (الحمد لله) وە با براکەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵێ (یرحمك الله) خۆ ئەگەر ووتی (یرحمك الله) با بڵێت (یهیدکم الله و یصلح بالکم) واتە : خوای گەورە ڕێنمونیتان بکات و کارەکانیشتان بۆچاك بکات [3] .

---

(١) (رواه البخاري)
(٢) (رواه البخاری) (٣) (رواه البخاری و غیره)

www.iqra.ahlamontada.com

٥- لەکاتی بینینی کەسانی کەم ئەندام وگیرۆدەدا : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (من رأى مبتلى فقال : الحمد لله الذي عافاني مما إبتلاك به و فضلني على كثير ممــن خلق تفضيلا ، لم يصبه ذلك البلاء) [1] واتە : (هەرکەسێ کەسێکی کەم ئەندامی بینی بڵێت : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەشی ساغ کردم لەو کەم وکوڕیانەی کەبەو کەسەوەیە وە ڕێز و گەورەیی منیدا بەسەر زۆربەی دروستکراوەکانیدا بە ڕێز و گەورەیی یەکی تەواو ، ئەوا ئەو کەم ئەندامی یە تووشی ئەم نابێت)

٦- لەدوای هەستانەوە لە ڕکوع

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (ئەگەر ئیمام ووتی ((سمــع الله لمن حمده)) بڵێن (ربنا لك الحمد) چونکە هەرکەسێك ئەم ووتەیەی لەگەڵ وتەی فریشتە کاندا یەك بگرێت خوای گەورە لە هەموو گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێت) [2].

٧- لە دوای نوێژ

لە ئەبو هورەیرەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (هەرکەسێك لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز سی‌و سێ جار (سبحان الله) بکات و سی و سێ جار (الحمد لله) و سی‌و سێ جار (الله أكبر) و لەسەری سەد هەم دانەدا بڵێت ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك و له الحمد ، و هو على كل شيء قدير) خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت ئەگەرچی وەکو کەفی دەریاش وابێت) [3].

٨- لەکاتی هەستان لە خە و لە شەودا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (هەرکەسێك کە هەستا لە خەو لە شەودا بڵێت : (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك و له الحمد ، يحيي و يميت و هو على كل شيء قدير ، الحمد لله ، و سبحان الله ، و لا إله إلا الله ، و الله أكبر ، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم) ئینجا بڵێ (اللهم اغفرلي) ئەگەر پاڕایەوە پاڕانەوەکەی وەردەگیرێت وە ئەگەر دەست نوێژیشی گرت و نوێژی کرد نوێژەکەی وەردەگیرێت و قبوڵ دەبێت) [4].

---

(١) (صحيح رواه الترمذي) (٢) (متفق عليه) (٣) (موسلیم گێڕاویەتیەوە)(٤) (رواه البخاري و غيره)

www.iqra.ahlamontada.com

# الرحمن الرحیم

﴿ الرحمــن الرحیــم﴾ دوو نــاون وەرگــیراون لــە (الرحمـــة) وەواتــە بــەزەیی لەسەرشێوەی (موبالەغە) و زۆری ، وە (الرحمن) زیاتر موبالەغەی تیایە لە (الرحیم) وە (الرحمن) وەرگیراوە (مشتق)ە وە بەڵگەش لەسەر ئەمە : لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفـەوە ﷺ لـە پێغەمبـەر ﷺ ی بیسـتووە کـە فەرموویـەتی : خـوای گــەورە دەفەرموێ ( انا الرحمن خلقت الرحم و شققت لها اسما من اسمـــي فمـــن وصلـــها وصلته و من قطعها قطعته) [1] .

واتە : (من (الرحمن)م بەزەیم دروست کردووە وە ناوێکم بۆ خۆم لێ وەرگرتووە هەرکەس بەدەم ئەو بەزەیی وسیلەی ڕەحمەوە بچێت بەدەمیەوە دێم ، وە هەرکەس بیپچڕێنێ لێی دەپچڕێم) .

قرطبی دەڵێ : ئەمە دەقێکە بۆ وەرگرتنی ئەو ناوە ، وە بەڵگەیە لەسەر ئەو وەرگێرانە ئیتر جیایی و موخالەفە هیچ مانای ێیە .

وە ئیبن جریر بە سەنەدەکەی لە عەزرەمی‌یەوە دەڵێ ﴿ الرحمـن الرحیـم ﴾ (الرحمن) بۆ هەموو بونەوەرە ، وە (الرحیم) بۆ باوەڕدارانە . ووتیان : لەبەر ئەمە دەفەرموێ ﴿ ثم استوی علی العرش الرحمن ﴾ (الفرقـان/٥٨) واتە : (ئینجا لەسەر عەرش بەرز و بڵند بوویەوە خوای بەبەزەیی) ، وە دەفەرموێ : ﴿ الرحمـن علـی العرش استوی ﴾ (طه/٥) واتە : (خوای بەبەزەیی لەسەر عەرش بەرز و بڵندە) .

لێرەدا ناوی (الإستواء) بەرزی و بڵندی بە (الرحمن) بردووە بۆ ئەوەی هەموو بوونەوەر بەبەزەیی خۆی دابپۆشێ .

وە دەفەرموێ : ﴿ و کـان بـالمؤمنین رحیمـا ﴾ لێرەدا جیای کردونەتەوە بە ناوەکەی کە (الرحیم)ە . ووتیان : ئەمە بەڵگەیە کە (الرحمن) زیاتر موبالەغەی تیادایە لەبەزەیی‌دا لە (الرحیم) لەبەر گشتییان بۆ هەردوو دونیاکە.

---

(١) (أخرجه الترمذي و صححه)

www.iqra.ahlamontada.com

# (الرحمن) تایبەتی‌یە و (الرحیم) گشتی‌یە

(الرحمن) واتە خوای گەورە بەبەزەیی‌یە بۆ خەڵکان لە دونیا و قیامەتدا ، وە (الرحیم) تایبەتە بە باوەڕدارانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا .

خوای گەورە ڕەحم دەکات بە باوەڕداران و بێباوەڕان لە دونیادا هەروەکو یەك وە بە یەکسانی لە ڕووی مەعیشەتی ژیانەوە ، وە چی پێویستیانە بۆ ژیانی دونیایان ، وە بەزەیی خوای گەورە لێرەدا گشتی‌یە چونکە ئەگەر گشتی نەبێت هۆکاری لێپرسینەوە تەواو نەدەبوو و ناتەواو دەبوو لە نیعمەتەکانی بەسەر ئادەمیزادەوە لە ئەقڵ و ژیریدا کە بەهۆیەوە حەق لە ناهەق جیا دەکەنەوە ، وە نیعمەتی ڕام کردنی ئەوەی کە لە بوونەوەردا هەن بۆ ئەوەی خەڵکی سەر زەوی سوودیان لێ ببینن لە مرۆڤ و جنۆکە ﴿ هو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعا ﴾ (البقرة/٢٩) واتە : (ئەوە ئەو خوایەیە کە چی لەسەر زەوی‌دا هەیە بۆ ئێوەی بەدی هێناوە)

کەواتە : تەواو بوونی هۆکانی لێپرسینەوە لە دونیادا لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەبێت وە ئەوەی کە هاتووە لەو پاڕانەوەیەدا :

(یا رحمن الدنیا و الآخرة و رحیمهما) ، (رحیمهما) ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە موسوڵمانان ڕەحم پێ دەکات لە دونیادا بەوەی کە گوێڕایەڵی‌یان کردووە و باوەڕیان پێ هێناوە ، وە فەرمانەکانیان بەجێ هێناوە ، وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی و ئاسان کردنی ئەم ڕێگایە بۆیان ، وە بەبەزەیشە بۆیان لە قیامەتدا بەوەی کە دەیان خاتە بەهەشتەوە وە ئەمە دەکاتە پاداشتیان بۆ ئەو کارانەی کە پێش دەستی خۆیان داوە لە باوەڕ هێنان و گوێڕایەڵی کردن ، کەواتە گوێڕایەڵی‌یان لە دونیادا بۆ خوای گەورە بەزەییەکە بۆیان لەلایەن خوای گەورەوە ، وە پاداشت دانەوەیان بەبەهەشت بەزەیی‌یەکە لەلایەن خوای گەورەوە بۆیان بە هەمان شێوە ئەمە مانای (ورحیمهما) یە و خوای گەورەش باشتر دەزانێت [1] .

---

(١) (لە ووتەکانی (محمد نسیب الرفاعی) لەسەر -مختصر تفسیر إبن کثیر- )

www.iqra.ahlamontada.com

## لە ڕێنمونی ئایەتەکە

١- الرحمن : ناوێکی تایبەتـە بـە خـوای گـەورەوە شـیاو نی‌یـە ئـەم نـاوە بـۆ کەسی‌تر ، وە بە هیچ ناوێکی تریش کە تایبەتە بە خوای گەورەوە.

بۆنمونە (الله ، خالق ، رزاق) وە جگە لەمانە .

٢- (الرحیم) ناوو سیفەتێکە بۆ خوای گەورە ، وە خوای گەورە وەسفی جگە لە خۆیی پێ کردووە وەك فەرموویەتی ﴿ لقد جاءكم رسول من أنفسكم عزيز عليه ما عنتم حريص عليكم بالمؤمنين رؤوف رحيم ﴾ (التوبة/١٢٨) .

واتـە : (بەڕاسـتی پێغەمبـەرێکتان بـۆ هـاتووە لـە دەروونی‌خۆتـان کـە دەرد و ڕەنجـی ئێـوە لەسـەری گرانـە و لەسـەر ڕێنمونـی ئێـوە سـوورە و سـەبارەت بـە باوەڕداران بە ڕەحم و بەبەزەیی‌یە) .

وە نمونـەی (الرحيـم) : السـميع ، البصـير ، خوای گـەورە دەفـەرموێ ﴿ إنـا خلقنـا الإنسان من نطفة امشاج نبتليه فجعلناه سميعا بصيرا ﴾ (الإنسان/٢) .

واتـە : (ئێمـە مرۆڤمـان دروسـت کـردووە لـە ئـاوێکی تێکـەڵاو وە گێڕاومانـە ، بەوەی کە بیسەر و بینا بێت) .

٣- ئایەتەکـە بەڵگەیـە لەسـەر یـەکتایی نـاوو سـیفەتەکان کـە (الرحمـن الرحيـم) دەگرێتەوە.

## ملك يوم الدين

١- هەندێ لە خوێنەرەکان بە (ملك يوم الدين) دەیخوێنن (الفاتحة/٤)

٢- وە ئەوانی تریش بە (ملك يوم الدين) دەیخوێننەوە وە هـەردوو خوێندنەوەکە ڕاستە و موتەواتیرە لە حەوت خوێندنەوەکەدا ، وە تایبەتی کردنی (ملك) بە ڕۆژی قیامەت ئەوە ناگەیەنێ کە خوای گەورە تەنها پاشای ڕۆژی قیامەتە و پاشای دونیا نی‌یە ، بەڵکو خوای گەورە پاشای دونیا و قیامەتە چونکە ئەوە ڕابوورد کە خوای گەورە پەروەردگاری هـەموو جیهانـە ، وە ئەمـە گشـتی‌یە لـە دونیـاو قیامـەتدا (وە کاتێك کە دەفەرموێ ((ملك يوم الدين)) ئەو پاشایەتیە دەداتە پاڵ قیامـەت چونکە

www.iqra.ahlamontada.com

لەوێدا کەس ناتوانێت بانگەوازی پاشایەتی بکات جگە لە خوای گەورە ، وە کەس ناتوانێت قسە بکات مەگەر بە یارمەتی ئەو نەبێت وەکو چۆن دەفەرمویٰ :﴿ يوم يقوم الروح و الملائكة صفا لا يتكلمون إلا من أذن له الرحمن و قال صوابا ﴾(عم/٨) واتە : ( ڕۆژێك کە جوبرەئیل و فریشتەکان بە ڕیز ڕادەوەستن کەس قسە ناکات مەگەر کەسێك کە خوای گەورە یارمەتی پێ بدات وە قسەی چاك بکات ) .

٣- وە زەحاك دەڵێ لە ئیبنوعەباسەوە (ملك يوم الدين) دەفەرمویٰ : کەس ناتوانێت و توانای پاشایەتی و خاوەنێی نی یە بۆ هیچ فەرمانێك وەکو پاشایەتی کردنیان لە دونیادا مەگەر خوای گەورە نەبێت.

٤- (يوم الدين) ڕۆژی پرسینەوەی دروست کراوەکانە ، وە ئەمە ڕۆژی قیامەتە خوای گەورە پاداشتیان دەداتەوە بە کردەوەکانیان ئەگەر چاك بوو وەئەگەر خراپ بوو خراپ ، وە مەگەر خوای گەورە لێی خۆش بێت ، دە خوایە گیان تۆ لێبوردەیت لێبوردەییت خۆش دەوێت لێمان ببورە [1] .

## لە ڕێنموونی ئایەتەکە

١- پاشا لە ڕاستیدا تەنها خوای گەورەیە ، وە ئەمە (المَلِــــكُ) وەرگیراوە لە ووشەی (المُلك)ەوە ، خوای گەورە دەفەرمویٰ :﴿ هـو الله الـذي لا إلـه إلا هـو الملك القدوس السلام ﴾ (الحشر/٢٣) واتە (ئەوە ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لەو کە پاشایە ، بە پیرۆز گیراوە ئاشتی یە).

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە (اخنع اسم عند الله من تسمى بملك الإمــلاك ، ولا مـــــالك الا الله) [2] واتە : (خراپترین نـاوێك کـە ببێتـە جێگـای تـوورە بوونی خوای گەورە کەسێکە کە ناوی خۆی بنـێ بە پاشای پاشایان ، وە پاشاش نی یە مەگەر خوای گەورە نەبێت)

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إن الله قد بعث لكم طالوت ملكا ﴾ (البقــــرة/٢٤٧) واتە : (بەڕاستی خوای گەورە تالوتی بۆ ئێوە ناردووە بە پاشا) ، لێرەدا ناولێنانی (طالوت) بە (ملك) مەجازەو لە ڕاستیدانی یە .

---

(١) (مختصر ابن كثير للرفاعي) (٢) (رواه البخاري)

www.iqra.ahlamontada.com

وە لەو فەرموودەیەشدا هاتووە دەڵێت (مثـل الملـوك علـى الأسـرة) [1]
واتە : (نمونەی پاشا بەسەر خێزان و ماڵ و منداڵەوە) .

٢- پاشا (المالك) لە ڕاستیدا تەنها خوای گەورەیە ، وە وەرگیراوەلە(الملك) وە (وە ناو لێنانی جگە لە خوا بەم ناوە مەجازییە و بۆ ڕاستێتی نییە) .

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ أما السفينة فكانت لمسكين يعملون في البحر ﴾ واتە : (سەبارەت بە کەشتیەکە ئەوە هی بێ نەوایان بوو کە لە دەریادا کاریان پێ دەکرد) (ئەو کەشتیە بۆ بێ نەواکان (ملك)ێك بوو بۆیان لە دونیادا) .

## إياك نعبد و إياك نستعين

١- ﴿ إياك ﴾ مەفعولە پێشخراوە بۆ زۆرێتی و تایبەتمەندی و دیاری کردنە ، واتە بۆ ئەوەی قسە کەر دیاری بکات کە بەرەو ڕووی کێ قسە دەکات .

٢- ﴿ إياك نعبد ﴾ واتە : ناپەرستین تەنها تۆ نەبێت ، وە پشت بە کەس نابەستین مەگەربە تۆ نەبێت ، وە ئەمە تەواوی گوێڕایەڵییە ، وە بەندایەتی لە زمانەوانیدا بە مل کەچ بوون دێت ، دەڵێن (بعير معبد) واتە حوشترێکی مل کەچ و گوێڕایەڵ .

وە لە شەرعدا : ناوێکی کۆکەرەوەیە کە تەواوی خۆشەویستی و مل کەچی و ترس کۆ دەکاتەوە و تایبەتمەندی دەکات بە خوای پاك و بێ گەردەوە .

٣- هەندێ لە پێشین دەفەرموون : ((الفاتحة سر القرآن و سرها هذه الكلمة : ﴿ إياك نعبد و إياك نستعين ﴾)) واتە : فاتیحە نهێنی قورئانە وە نهێنی فاتیحەش ((إياك نعبد و إياك نستعين))ە کەواتە :

**یەکەم** : واتە ﴿ إياك نعبد ﴾ بە مانای خۆ بێبەری کردن لە هاوەڵ پەیدا کردن دێت .

**دووەم** : واتە ﴿ إياك نستعين ﴾ بە مانای خۆبێبەری کردن لە پشت بەستن و توانا و هێز تەنها بە خوای گەورە نەبێت .

---

(١) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

٤- لە ئایەتەکەدا : هەڵگێڕانەوەی قسە لە (غائیبەوە) بۆ بەرامبەر بە (ك) ی خطاب) قسە کردن بە ووشەی (إیاك) وە ئەمەگونجاوە چونکە کاتێك بەندە کە سوپاسی خوا دەکات وە بە گەورەی دادەنێ و شوکرانەی دەکات و خۆی بێبەری حکات لە بەندایەتی کردن بۆ جگە لە خوا ، وە لەداواکردن تەنها لەو نەبێت ، بەمانە نزیك دەبێتەوە لە خوای : الله دەست ، وە ئامادە دەبێت لە نێوانی دوو دەستەی خوای گەورەدا ، وە ئەمەش وا دەگونجێ کە بە (ك) ی (خطاب) قسەی لەگەڵدا بکرێت کە دەفەرموێ : ﴿ إیاك نعبد و إیاك نستعین ﴾ .

وە ئیبنوعەبباس رضي الله عنه دەڵێت :

﴿ إیاك نعبد ﴾ واتە تەنها تۆ بە خوا دەزانین وە لە تۆ دەترسین وە لە تۆ دەپارێینەوە ئەی پەروەردگارمان ، نەك جگە لە تۆ وە (إیاك نستعین) واتە تەنها داوای یارمەتی لە تۆ دەکەین لەسەر گوێڕایەڵی تۆ لە هەموو کارەکانماندا . وە خوای گەورە ﴿ إیاك نعبد﴾ ی پێش خستووە بەسەر ﴿ إیاك نستعین ﴾ دا : چونکە بەندایەتی کردن مەبەستی سەرەکیە ، وە پشت بەستن ڕێگایەکە بۆی [(١)]

ئیبنولقەیم لە (مدارج السالکین) دا دەڵێت :

نهێنی بوونەوەر پەڕاو و شەریعەت و یاساکان و پاداشت و سزاکان تەواو دەبێت بۆ ئەم دوو ڕستەیە ، وە هەرلەسەر ئەمە وەستاوە بەندایەتی و یەك خواپەرستی ، هەتا ئەوکاتەی ووتراوە : خوای گەورە سەدو چوار پەڕاوی ناردووە . مانای هەموویانی کۆکردۆتەوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا وە مانای ئەم سێ پەڕاوەی کۆکردوەتەوە لە فاتیحەدا لە ئایەتی ﴿ إیاك نعبد و إیاك نستعین ﴾ دا .

## لە ڕێنمونی ئایەتەکە

١- زانایانی زمانەوانی عەرەبی باسی ئەوەیان کردووە کە خوای گەورە (مفعول بە)ی (إیاك)ەی بەسەر فعلی (نعبد) و (نستعین) دا پێش خستووە ، بۆ تایبەتمەند کردنی بەندایەتی و داوای یارمەتی خواستن تەنها لە خوای گەورە ، وە جیای دەکاتەوە لە هەموو کەسێکی تر جگە لە خوا ، ئەو کاتە ماناکەی : کەس ناپەرستین تەنها تۆ نەبێت ، وە داوای یارمەتی ناخوازین تەنها لە تۆ نەبێت ئەی خوای گەورە .

---

(١) (إبن کثیر)

www.iqra.ahlamontada.com

وە پایەکانی بەندایەتی : دڵسۆزی ، خۆشەویستی ، داوا کردن ، ترسـان ، وە پەرستنی خوای گەورە بەوەی کە دایناوە و پێی ڕازی‌یە ، بەپێی سوننەت و ڕێنمویی پێغەمبەر ﷺ .

٢- مانای بەندایەتی و داواکردن و پشت بەستن لەم ئایەتەدا : ﴿ إياك نعبد و إياك نستعين ﴾ .

﴿ إياك نعبد ﴾ تەنها تۆ دەپەرستین ، تەنها تۆ بە خوا دەزانین و تەنها لە تۆ داوا دەکەین و دەترسین ، ﴿ و إياك نستعين ﴾ تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەخوازین لەسەر بەندایەتی بۆ کردنت .

خوای‌گەورە دەفەرموێ ﴿ و ما خلقت الجن و الإنس إلا ليعبدون ﴾ (الذاريات/٥٦) واتە : (پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە مەگە بۆ بەندایەتی کردن نەبێت) .

٣- بەندایەتی کردن لەم ئایەتەدا هەموو جۆرەکانی بەندایەتی کردن دەگرێتەوە ، وەکو : نوێژ ، قورئان ، نەزر ، بە تایبەتی پاڕانەوە لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (الدعاء هو العبادة) [1] واتە : (پاڕانەوە بەندایەتی کردنە) .

وەکو چۆن نوێژ بەندایەتی کردنە شیاو نی‌یە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، دۆست ، ......، بەهەمان شێوە پاڕانەوەش بەندایەتی کردنە و تایبەتە بە خوای گەورە و کەسی تر ناشێت جگە لەو : ﴿ قل إنما أدعوا ربي ولا أشرك بة أحدا ﴾ (الجن/٢٠)

واتە : (بڵێ من هاوار و بەندایەتی تەنها بۆ خوا دەکەم و کەسی تر ناکەمە هاوەڵی ). وەلەبەر ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( إذا سألت فأسأل الله و إذا أستعنت فأستعن بالله ) [2] . واتە : (ئەگەر داوات کرد تەنها داوا لە خوا بکە وە ئەگەر یارمەتیت خواست تەنها لە خوای گەورەی بخوازە ) .

ئیمامی نەوەوی لە تەفسیری ئەم فەرمودەیەدا دەفەرموێ کە ئەمە کورتەکەیەتی : (( ئەگەر داوای یارمەتیت کرد لە کارێك لە کارەکانی دونیا و قیامەتدا تەنها داوا لە خوا بکە ، بەتایبەتی لەو کارانەدا کە کەس توانای بەسەریدا نی‌یە مەگەر خوای

(١)(رواه الترمذی و قال حدیث حسن صحیح)

(٢)(رواه الترمذی و قال حسن صحیح)

www.iqra.ahlamontada.com

گەورە نەبێت وەکو چارەسەری نەخۆشی ، داوای ڕزق و ڕۆزی و ڕێنموویی کردن تەنها داوا لە خوا بکە ، کە ئەمانە تەنها تایبەتە بە خواوە و تەنها داوا لەو دەکرێ خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و إن يمسسك الله بضر فلا كاشف له إلا هو ﴾ (الأنعام/١٧) واتە : (ئەگەر خوای گەورە زیانێکت پێ بگەیەنێ هیچ کەس ناتوانێت ئەو زیانەت لێ دوور بخاتەوە مەگەر خوا نەبێت) .

٤- بەڵام داوا کردن لە زیندووان ئەوانەی کە ئامادە و حازرن لەو شتانەی کە توانایان بەسەردا هەیە وەکو پێدانی دەرمان بە نەخۆش ، یان کردنەوەی مزگەوت ، وە جگە لەمانە جائیز و شیاوە لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ وتعاونوا على البر و التقوى ﴾ (المائدة /٢) واتە : (وە هاوکاری یەکتر بکەن لە چاکە و لە خوا ترساندا ) .

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (و الله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه) [1] واتە : (خوای گەورە لە یارمەتی بەندەدایە کاتێ کە بەندە لە یارمەتی براکەیدایەتی) .

وە نموونەی یارمەتی شیاو و جائیز خوای گەورە دەفەرموێ لە بارەی داوا کردنی (ذي القرنين) لە گەلەکەی ﴿ فاعينوني بقوة ﴾ (الكهف/٩٥) واتە : (بەهێزێك یارمەتیم بدەن)

٥- ئەم ئایەتە ﴿ إياك نعبد و إياك نستعين ﴾ کە موسوڵمان دەیان جار دووبارەی دەکاتەوە لە نوێژدا کورت کراوەی سورەتی فاتیحەیە ، وە سوورەتی فاتیحە گەورەترین سوورەتە لە قورئاندا .

٦- لە ئایەتەکەدا یەك خوا پەرستی تێدایە کە هەموو پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ کردووە . خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و لقد بعثنا في كل أمة رسولا أن أعبدوا الله و اجتنبوا الطاغوت ﴾ (النحل/٣٦) واتە ( بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە کە پێیان بڵێ خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە تاغوت) وە (طاغوت) هەموو کەسێکە کە جگە لە خوا دەپەرسترێ و ئەمیش پێی ڕازی بێت .

www.iqra.ahlamontada.com

## إهدنا الصراط المستقيم

لە کاتێکدا سوپاس کردنی خوای گەورە ڕابوورد شیاوە کە داوای لێ بکرێ وەکو دەفەرموێ : ﴿ فنصفها لعبدي و لعبدي ما سأل ﴾ واتە نیوەی بۆ بەندەکەمە بۆ بەندەکەمە لە چی پرسیار دەکات وە ئەمە تەواوی حاڵی داواکەرە کە مەدحی داوا لێ کراوەکەی بکات ئینجا داوای پێویستی‌یەکانی لێ بکات ، وە پێویستی برا موسوڵمانەکانیشی کە دەفەرموێ : ﴿ إهدنا الصراط المستقيم ﴾ واتە : خوایە گیان ڕێنمونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست ، وەئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ هاندان لەسەر (توسل) نزیك بوونەوە بە سیفاتە بەرزەکان و بە کارە چاکەکان ، ئەوەبوو سوپاسی خوای کرد و ستایشی کرد وە بە گەورەشی دانا بە سیفاتەکانی ( رب العالمين ، الرحمن الرحيم ، مالك يوم الدين ) .

ئینجا بە تەنهای دانا بۆ بەندایەتی و داوای یارمەتی ، لە دوای ئەوەی کە لەبەردەمی خوای گەورەدا ئەم کردارە چاکانەی پێش خشت ڕابوورد کە پرسیارو داوای برا موسوڵمانەکانی لێ کرد کە ڕێنمونی‌یان بکات بۆڕێگای ڕاست کە ئیسلامە ڕاستەکەیە و خاڵی‌یە لە هەموزیادی و کەم و کوڕی‌یەك ، پاکە لە هەموو بیدعە و شتێکی پڕ و پووچ ، وە ئەم ڕێگایە نزیکترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بەو شتانەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێن و ڕازی‌یە پێی ، وە پێغەمبەر ﷺ گەیاندوویەتی و ڕوونی کردەتەوە ، خۆ ئەگەر موسوڵمان بڕوانێتە ئایەتەکانی قورئان دەبینێ کە هەموو ئایەتەکانی سەبارەت بە پاڕانەوە ، ئەبێت نزیك بوونەوە (توسل) پێشی کەوتبێت بۆ خوای گەورە یان ئەوەتا بە پاڕانەوەکانی ، یان بە زاتی خوا یان بە ناوە جوانەکانی ، یان بە سیفاتە بەرزەکانی ، یان بە کرداری چاکە کەپێی نزیك دەبێتەوە لە پەروەردگاری ، یان لێی نزیك دەبێتەوە بە پاڕانەوەی برا موسوڵمانەکانی یان بە پاڕانەوەی ئەم بۆ ئەوان .

خوای گەورە لەسەر زمانی (ذی النون) یونس عليه السلام دا دەفەرموێت : ﴿ لا إله إلا انت سبحانك إني كنت من الظالمين ﴾ (الأنبياء/٨٧)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (هیچ خوایەك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ کە پاك و بێگەردی هەر بۆتۆیە بەڕاستی من لە ستەمکارانم)

سەیر کە کە (ذی النون) کاتێ کە حوتەکە قوتی دا هیچ ڕێگایەکی نەدۆزی‌یەوەلە نزیك بوونەوە (التوسل) لە پەروەردگاری لە بەیەکخواداناني خوا و پاك و بێ گەرد دانانی نەبێت [1] .

وە ڕێنمونی لێرەدا : ڕێگا ڕوونی و سەرکەوتنە ، وە ڕێنمونی‌یەکە تێ پەڕ دەکات بە خودی خۆی دەکو دەفەرموێ : ﴿ إهدنا الصراط المستقیم ﴾ کە بە مانای : ڕامان بێنە ، لەش ساغمان بکە ، ڕۆزیمان بدە ، پێمان ببەخشە.

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و هدینه النجدین ﴾ (البلد/١٠) واتە : (وە ڕێنمونیمان کرد بۆ دوو ڕێگا ، چاکە و خراپە) واتە : چاکە و خراپەمان بۆ ڕوون کردەوە ، وە تێ پەڕی دەکات بە (إلی) وەکو دەفەرموێ ﴿ اجتبه و هد ه إلی صراط مستقیم ﴾ (النحل/١٢١) واتە (خوای گەورە هەڵی بژاردو بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنمونی‌کرد)

﴿ فأهدوهم إلی صراط الجحیم ﴾ وە ئەمەش بە مانای ڕێنمونی و ڕێ نیشان دان دێت .

بە هەمان شێوە دەفەرموێ ﴿ و انك لتهدی إلی صراط مستقیم ﴾ (الشوری/٥٢) واتە : (بەڕاستی تۆ بۆلای ڕێگای ڕاست ڕێنمونی دەکەیت) ، وە تێ‌پەڕی دەکات بە (ل) وەکو ئەوەی کەخەڵکی بەهەشت دەڵێن ﴿ الحمد لله الذی هدانا لهذا ﴾ واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمونی کردین بۆ ئەم بەهەشتە و گێڕاینی بە خەڵکێکی ئەم شوێنە .

بەلام (الصراط المستقیم) ئیمامی طبری دەفەرموێ : ئوممەتی ئیسلامی کۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە (الصراط المستقیم) بریتی‌یە لە ڕێگایەکی ڕوون و ڕاست کە هیچ لاری‌یەکی تێدا نی‌یە ، وە ئەمە لە زمانی گشت عەرەبدا وایە.

---

(١) انظر مختصر إبن کثیر للرفاعي)

www.iqra.ahlamontada.com

وە هەر لەبەر ئەوە ئیمانی طبری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ : ئەوەی کە نزیکترینە بەلامەوە لە تەفسیر کردنی ئەم ئایەتە ، واتە (صراط المستقیم) ئەوەیە کە خوای گەورە مەبەستی ئەوەیە : یارمەتیمان بدە بۆ جێگیر بوون لەسەر ئەو شتانەی کە تۆ پێی ڕازیت و یارمەتی بەندەکانت داوە لەسەری کە نیعمەتی خۆتت بەسەردا ڕشتوون ، لە ووتەو کردار وە ئەمە (الصراط المستقیم) چونکە هەرکەس خوای گەورە جێگیریی بداتێ بۆ ئەو جێگیریە کە بە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانی داوە ، ئەوا جێگیر کراوە لەسەر ئیسلام و بەڕاست زانینی پێغەمبەران ، وە دەست گرتن بە قورئان و کارکردن بەوەی کە فەرمانی پێ کردووە وە تووڕەبوون وناکۆکی کردن لەوەی کە نکوڵی و قەدەغەی کردووە ، وە شوێن کەوتنی مەنهەج و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و مەنهەج و ڕێگای چوار جێ نشینەکە و هەموو بەندەیەکی چاك ، وە هەموو ئەمانە لە (الصراط المستقیم) ن .

## لە ڕێنمونی ئایەتەکە

١) هاندان لەسەر داوا کردن و پاڕانەوە تەنها لە خوای گەورە ، بە تایبەتی ڕێگا ڕوونی و ڕێنمونی بۆ ڕێگای ڕاست ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و أن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون ﴾ (الأنعام/١٥٣)

واتە : (بە ڕاستی ئەمەیە ڕێگای ڕاستی من دە شوێنی بکەون و شوێن لاڕێ و ڕێگا چەوتەکان مەکەون بە شێوەیەك کە ڕێگا ڕاستەکەی خوای گەورە وون بکەن ، ئا بەمە ئامۆژگاریتان دەکات خوای گەورە بەڵکو لە خوا بترسن)

وە کۆمەڵێك لە هاوەڵان دەڵێن (الصراط) بریتی‌یە لە ئیسلام .

٢- خوای گەورە فێرمان دەکات کە داوای ڕێگای ڕاست بکەین لە سەرەتادا بەبێ ناوبردنی کەسەکان و شوێن کەوتەی ئەو ڕێگایە ، چونکە ئەگەر ڕێگا ڕاستەکە و نیشانەکانیمان زانی ئەو کاتەخەڵکانیشی دەناسین ، وەلەم کاتەدا خوێنەر دەڵێ ( الصراط الذين أنعمت عليهم) ئینجا حەق بناسە خەڵکانیشی دەناسی ، کە حەق (الصراط)ە وە خەڵکانشی ئەوانەن کە خوای گەورە نیعمەت و چاکەی خۆی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان کە چەند جوانە هاوەڵایەتی ئەمانە.

www.iqra.ahlamontada.com

# صراط الذين أنعمت عليهم

١- ﴿ صراط الذين أنعمت عليهم ﴾ ڕوون كردنەوەی (صراگ المستقيم)ە ،وە ئەو كەسانەی كە خوای گەورە نیعمەتی خۆی پێداون لەو ئایەتەدا باس كراون كە دەفەرموێ ﴿ و من يطع الله و الرسول فأولئك مع الذين أنعم الله عليهم من النبيين و الصديقين و الشهداء و الصالحين ، و حسن أولئك رفيقا ، ذلك الفضل من الله و كفى بالله عليما ﴾ (النساء/٦٩-٧٠)

واتە :هەركەسێك گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ بكات ئەوە لەگەڵ ئەوانەدایە كە خوای گەورە نیعمەتی خۆیی پێداون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاكان ، كە چەند جوان و چاكە هاوەڵایەتی ئەمانە ، بەڕاستی ئەمە بەخشش و گەورەییە كە لەلایەن خواوە و بەسە بۆ خوای گەورە كە زانا بێت)

٢- وە زەمحا لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێ : ڕێگای ئەو كەسانەی كە نیعمەتی خۆتت پێ داون بەگوێڕایەڵیت و بەندایەتیت لە فریشتەكان و پێغەمبەرەكانت و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاكان ، ئەمە ئەو مەبەستەیە كە خوای گەورە لە ئایەتی ڕابوردودا باسی كرد .

## لە ڕێنمونی ئایەتەكە

١- هاندان لەسەر داوا كردنی ڕێگای ڕاست و ڕێگای ڕوون كە ڕێگای ئەو كەسانەیە كە خوای گەورە نیعمەتی خۆیی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاكان .

٢- هاندان لەسەر گرتنی ڕێگا و ڕەوشتی پیاو چاكان كە خوای گەورە بە چاك باسیان دەكات وە خۆشویستنیان و ڕۆیشتن لەسەر ڕێگا و ڕەوشتیان .

www.iqra.ahlamontada.com

# غير المغضوب عليهم ولا الضالين

١- خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ غير المغوب عليهم ولا الضالين ﴾ واتە : بێجگە لە ڕێگای ئەو کەسانەی کە لێیان تورەیت و غەزەبت لێ گرتوون : وە (المغضوب عليهم) بریتین لەوانەی کە بیر و باوەڕێکی خراپ و ئیرادەیەکی پیسیان هەیە کە حەق دەزانن بەڵام خۆیانی لێ لادەدەن.

٢- وە بێجگە لە ڕێگای گومڕا بووان (ولا الضالين) : بریتین لەو کەسانەی کە زانستیان وون کردووە و ڕۆچوون لە گومڕایدا ، ڕێنموویی ناکرێن بۆ حەق وە قسەکە بە (لا) تەئکید دەکاتەوە بۆ ئەوەی بەڵگە بێت بۆ دوو ڕێگای خراپ و چەوت کە ئەوانیش : ڕێگای یەهودو ڕێگای نەصارایە (گاوور و جوولەکە) .

٣- وە ڕێگای ئەهلی ئیمان بریتییە لە زانست و کارپێکردنی ، وە جوولەکەکان کارکردنیان وون کردووە و گاورەکانیش زانست ، لەبەر ئەمە تورەیی و غەزەب بۆ جوولەکەیە و گومڕایش بۆ گاورەکان ، چونکە ئەوەی کە زانیویەتی و فێر بووە و وازی لێ هێناوە زیاتر شایستەی تورەیی و غەزەبە بە پێچەوانەی ئەوەی کە نازانێت .

٤- وە گاورەکان وەکو چۆن مەبەستیان شتێك بێت بەڵام بۆی ناڕۆن و تێی ناگەن ، چونکە ڕوویان نەکردۆتە کارەکە لە دەرگاکەیەوە کە ڕێگا ڕاستەکەیە ئەوەبوو گومڕا بوون ، وە هەموو یەکێك لە گاور و جوولەکە گومڕایە و خوای گەورە لێی تووڕەیە و غەزەبی بەسەردا باراندوون . بەڵام تایبەت ترین سیفاتی جولەکە تورەیی و غەزەبە، وە خوای گەورە دەفەرموێ لە بارەیانەوە ﴿ من لعنه الله و غضب عليه ﴾ (المائدة/٦٠) .واتە : ئەوەی کە خوای گەورە دووری خستونەتەوە لە ڕەحمەتی خۆیی و تورەیی و غەزەبی بەسەردا باراندوون .

٥- وە تایبەت ترین سیفاتی گاورەکان گومڕایییە وەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ قد ضلوا من قبل و أضلوا كثيراً و ضلوا عن سواء السبيل ﴾ (المائدة/٧٧) واتە : (کە گومڕا بوون لەمەو پێش و زۆرێکیشیان وە گومڕا کردووە وە گومڕا بوون لە ڕێگای ڕاست و ڕوون) .

www.iqra.ahlamontada.com

٦- حەمادی کوڕی سەلەمە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ : پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئەو ئایەتەی خوای گەورەوە کە دەفەرموێ ﴿ و لا الضالين ﴾ فەرمووی : ئەمانە گاورەکانن کە گومڕا بوون .

٧- وە ئیبن مەردەوەیهی لە ئەبی زەڕەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ : پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەی (المغضوب عليهم) فەرمووی (جوولەکەکانن) وتم ئەی (الضالين) فەرمووی (گاورەکانن) [1] .

## لە ڕێنمونی ئایەتەکە

١- ئاگادار کردنەوە لە ڕێگای ئەو کەسانەی کە خوای گەورە لێیان توڕەیەو غەزەبی خۆی بەسەردا باراندوون ، کە ئەوانیش جولەکەکانن کە ئەوانەن کە بیر و باوەڕ و ئیرادەیەکی خراپیان هەیە کە حەق و ڕاستیان ناسیوە بەڵام خۆیات لێ لاداوە ، وە کاریان پێ نەکردووە چونکە هەرکەس ڕاستی بزانێت و کاری پێ نەکات شایستەی توڕەیی وغەزەبی خوایە .

٢- ئاگادار کردنەوە لەڕێگای گومڕاکان : کە بریتین لە گاورەکان کە زانستی ڕاستیان وون کردووە ، لە گومڕاییدا ڕۆچوون ، ڕێنمونی وەرناگرن بۆ حەق و ڕاستی ، وە لەسەر موسوڵمانان پێویستە کە واز لە وەرگرتنی زانست و کارپێکردنی نەهێنن ، هەتا وەکو گاور و جوولەکەیان لێ نەیەت .

٣- ئاگادار کردنەوە لە گرتنی ڕێگای گاور و جوولەکە ، وە ترسان لە گرتنی ڕێگای ڕێ لێ وون بووان و خۆ بێبەری کردن لێیان .

٤- ئاگادار کردنەوە لە واز هێنان لە کارکردن کە جوولەکەی تێ کەوتووە ، وە ئاگادار کردنەوەش لە وازهێنان لە زانستی ڕاست و دروست کە گاورەکانی تێکەوتوە

٥- هەر دەبێت زانست و کارپێکردنی بەیەکەوە بێت و لێك دانەبڕێن ، وە ئەمە ڕێگای باوەڕدارانە ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إنما يخشى الله من عباده العلماء ﴾ (فاطر/٢٨) واتە : (بەڕاستی ئەوانەیکە زۆر لە خوا دەترسن زاناکانن) .

---

(١) (أنظر : مختصر إبن كثير للرفاعي)

www.iqra.ahlamontada.com

ئیبنو کثیر دەڵێ : هەرچەند زانست بوون بە خوای گەورە زیاتر و تەواو تر بێت ، لە خوا ترسان گەورەتر و تەواوتر و زیاتر دەبێت .

٦- لەسەر موسوڵمانان پێویستە کە بانگەوازی خەڵکی بکەن بۆزانست و کارپێکردنی بەیەکەوە بۆ ئەوەی ڕێنمونی بکرێن بۆ ڕێگای ڕاست و دروست .

## ئاگادار کردنەوە لە ڕێگای ڕێ لێ وون بووان

١- خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إهدنا الصراط المستقيم ، صراط الذين أنعمت عليهم ، غير المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾ (الفاتحة)

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ﴿ المغضوب عليهم ﴾ جوولەکەن و ﴿ الضالين ﴾ (گاورەکانن)[1]

٢- وە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ و إذ قلنا ادخلوا هذه القرية فكلوا منها حيث شئتم رغدا و ادخلوا الباب سجدا و قولوا حطة نغفر لكم خطاياكم و سنزيد المحسنين ﴾ (البقرة/٥٨)

واتە : (وە ئەو دەمەی کە ووتمان بچنە ناو ئەم ئاواییەوە و بە ئارەزووی خۆتان بخۆن لە چی دەتانەوێ و لە هەر کوێ هەیە بە فراوانی وە لە دەروازەکەوە بە سوجدە بردن بچنە ژوورەوە و بڵێن خوایە لە گوناهەکانمان خۆش بە بۆ ئەوەی ئێمەش لە گوناهو هەڵەکانتان خۆش بین ، وە بە کار چاکان پاداشتی زۆر تر دەدەین) .

أ- لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (قيل لبني إسرائيل ﴿ و أدخلوا الباب سجدا و قولوا حطة نغفر لكم خطاياكم ﴾ فبدلوا ، فدخلوا الباب يزحفون على استاههم ،و قالوا : حبة في شعرة )[2] .

---

(١) (رواه الترمذي و غيره و حسنه محقق جامع الأصول)

(٢) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

واتە : (ووتیا بە بەنی ئیسرائیل لە دەروازەکەوە بە سوجدە بردن بچنە ژوورەوە وە بلێن خوایە لێمان خۆش بە با ئێمەش لە هەڵەکاتان خۆش بین ، ئەوە بوو بە پشتا چوونە ژوورەوە ووتیان : تۆوێك لە دەنکە جۆیەکدا) .

ب- وە لە گێڕانەوەیەکی ترمزیدا (و أدخلوا الباب سجدا) دەڵێ : ڕۆشتنە ژوورەوە لەسەر شێوەی دانیشتن ، دەڵێ : وە بەم سەنەدەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ﴿ فبدل الذين ظلموا قولا غير الذي قيل لهم ﴾ (البقرة/٥٩) واتە : (ستەم کارەکان ئەوەی کە پێیان ووترابوو گۆڕیان بە جگە لەو قسەیەی کە پێیان ووترابوو) ، دەڵێ : ووتیان : ((حبة في شعرة)) وە لە گێڕانەوەیەکی تردا ((حبة في شعيرة)) واتە تۆوێك لە دەنکە جۆیەکدا .

ج- ئیبنو حەجەر لە (فتح) دا دەڵێت : بە کورتی ئەوان پێچەوانەی ئەو فەرمانە وەستانەوە کە فەرمانیان پێ کرابوو لە کردار و گوفتار ، چونکە ئەوان فەرمانیان پێ کرا بە سوجدە بردن لە کاتی تەواو بوونیاندا وەکو سوپاسێك بۆ خوای گەورە ، وە بە ووتنیان ((حطة)) واتە خوایە لێمان خۆش بە وە لە هەڵەکانمان ببورە ، بەڵام ئەوان سوجدەکەیان گۆڕی بە پشتاو پشت وە (حطة) یان گۆڕی بە (حنطة) واتە گەنم یان ووتیان (حطة) بەڵام (حبة في شعيرة) یان بۆ زیاد کرد.

وە لەمەوە ئەو حوکمە وەردەگیرێت کە ئەو ووتانەی کە دەقیان لەسەر هاتووە و بەندایەتی دەکرێ بە لەفزەکانیان جائیزنییە کە بگۆڕدرێت ئەگەر چی وەکو ماناکەشی وابێت وەلەگەڵ ماناکەیدا پێك بێت [1] .

## لە سوودی ئایەت و فەرموودەکان

١- هاندان لەسەر گرتنی ڕێگا و ڕەوشتی موسوڵمانان و ئاگادار کردنەوە و ترساندن لە ڕێگاو ڕەوشتی جوولەکەکان کە تووڕەیی و غەزەبیان لەسەرە بەهۆی بێ بڕوایی و بێ ڕەوشتییان و واز هێنانیان لە کارکردن بەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە ، وە لە گاورەکان کە گومڕابوون و ڕاستیان وەرگرتووە ، بەڵام موسوڵمانان زانست و کرداریان کۆکردۆتەوە لەگەڵ یەکدا .

---

(١) (ج٨/٣٠٤)

www.iqra.ahlamontada.com

**٢- ئاگادار کردنەوە لە گۆڕینی دەقە شەرعی‌یەکان و لابردنیان لەو مەبەستەی کە خوای گەورە دەیەوێت وەك چۆن جوولەکە کردیان :**

**کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردن کە بڵێن ( حطة ) ئەوان گۆڕی‌یان بە (حنطة) خوای گەورەش هەواڵمان دەداتێ کە خۆی ( استوى على العرش ) واتە بەرز و بڵند بۆتەوە لەسەر عەرش ، بەڵام گۆڕەرەکان ووتیان و دەڵێن (استولى) واتە زاڵبوون ، ئینجا سەیری کە چۆن ئەم (ل)ەیان چواند و شوبهاندووە بەو (ن)ی جوولەکە کە زیادیان کرد لە (حطة)دا و کردیان بە (حنطة) [١] .**

**٣- هەندێ لە موفەسیرین وەکو صابونی لە کتێبی (صفوة التفاسیر) وە (قاضی أحمد کنعان) لە کتێبەکەیدا (قرة العینین علی تفسیر الجلالین) دەڵێن لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ یوم یکشف عن الساق ﴾ واتە : ڕۆژێك کە پوز هەڵدەکرێ و دەردەخرێ .**

**دەڵێن : وە لەو فەرموودەیەدا (یسجد لله کل مؤمن و مؤمنة) فەرموودەکە بوخاری گێڕاویەتیەوە ، ڕۆشتوون سەرەتای فەرموودەکەیان لێ کردۆتەوە ونەیان هێناوە کە دەفەرموێ (یکشف ربنا عن ساقة) وە دەقە ڕاستەکەشیان نەهێناوە کە دەفەرموێ (فیسجد له کل مؤمن و مؤمنة) چونکە (ف) ەکە بۆ عەطفە و(لە) دەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە.**

**وەکاتێ کە پرسیارم کرد لە صابونی لە هۆی نەهێنانی و لێکردنەوەی سەرەتای فەرموودەکە کە بریتی‌یە لە (یکشف ربنا عن ساقة....) واتە : پەروەردگارمان پوزی دەردەخات ،وەڵامی دامەوە : هەموو موفەسیرەکان ئایەتەکەیان تەئویل کردووە!!! ئینجا ووتی : ئەوەی کە ویستوومە لە فەرموودەکەم وەرگرتووە!!!**

**أ-وە ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە لە کاتێکدا کە موفەسیرە بە تواناکان تەئویلی ئایەتەکەیان نەکردووە وەکو طبری و ئیبنوکثیر ، وە ئەمان فەرموودەکەیان بە تەواوی هێناوە هەتا ئەو کاتەی کە زانای بە توانا (صدیق حسن خان) وە شەوکانی بەهەمان شێوە لە تەفسیری ئایەتەکەدا ﴿ یوم یکشف عن ساق ﴾**

---

(١) سەیری (نونە)ی ئیبنولقەییم بکە ، وە پەڕاوی (منهج و دراسات) لمحمد بن أمین الشنقیطی

www.iqra.ahlamontada.com

وتویانە (( إذا جاء نهر الله بطل نهر معقل )) واتەکاتێك کە ڕووباری خوا هات ڕووباری عەقل بەتاڵ دەبێتەوە)) وە مەبەستیشیان فەرموودەکەیە کە ئایەتەکە تەفسیر دەکات ، کە بەڕاستی فەرموودە چاکترین موفەسیرە بۆ ئایەتەکانی خوای گەورە ، وە ئەمە (لاشە و تەشبیهو چواندن) ناگرێتەوە چونکە ( لیس کمثله شيء ) هیچ شتێك لە خوای گەورە ناچێت ئینجا ئەو وتەیەی شاعیر دەهێنێتەوە :

دعوا کل قول عند قول محمد

فما آمن في دينه كمخاطر

واتە : واز لە هەموو وتەیەك بهێنن لە ئاستی وتەیەی موحەممەددا ﷺ

ب- سەبارەت بەو وتەیەش کە دەڵێت : ئەوەی کە ویستوومە لە فەرموودەکەم وەرگرتووە ، ئەمە جائیز نییە بۆ مفەرسیر کە بیڵێت ، چونکە ئەمە مانای ئایەتەکە دەگۆڕێت کە پوز بۆ خوای گەورە جێگیر دەکات بەڵام پوزێك کە شیاوی خوای گەورەیە و تایبەتە بەخۆیەوە ، وە ئەوە دەردەکەوێ لەوەی کە سەرەتای فەرموودەکەی نەهێناوە بۆ ئەوەی کە ئەو پوزە جێگیر نەکات ، وەلەبەر ئەوەش کە ئەگەربیهێنایە مەبەستەکەی بەتاڵ دەبوویەوە کە تەئویل کردنە ، وەئەمە جۆرێکە لە گۆڕین و یاری کردن بە دەقەکان کە ئەو ئایەتانەی کە ڕابووردن لەوە دەمان ترسێنێ ، وە ئاگادار کردنەوە و ترساندنی پێغەمبەریش ﷺ دێت لەمەوداو بۆ ئەم جۆرە کارانە کە هەر ئەمەیە کە گاور و جوولەکەکانی تێکەوتووە .

ج- وە صابوونی تەفسیری ئەو ئایەتەی وا کردووە کە خوای گەورە دەفەرموێ : (و يدعون إلى السجود) واتە : وە بانگ دەکرێن بۆ سوجدە بردن ، دەڵێ : بە توندی و تیژی بانگیان دەکات بۆ سوجدە بردن بۆ خوای گەورە ، وە پێچەوانەی تەفسیری طبری) دەوەستێتەوە کە خۆی کورتی کردۆتەوە لە کاتێکدا (طبری) دەڵێ : (و يدعوهم الكشف عن الساق إلى السجود لله) واتە : (هەڵدانەوەی پوز وایان لێ دەکات و بانگیان دەکات بۆ سوجدە بردن بۆ خوای گەورە) .

٤- وە هەر لەم جۆرە گۆڕینە (تەحریفە) : لە یەکێك لە وتار بێژەکانم بیست لە ووتاری هەینیدا کە وتی : پیاوێکی کوێر هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وە داوای لێ کرد کە چاوی چاك بکاتەوە ، پێغەمبەریش ﷺ چاکی کردەوە ، کاتێ کە

www.iqra.ahlamontada.com

ووتارەکەی تەواو کرد خۆم گەیاندێ و پێم ووت ئەو فەرموودەیەی کە باست کرد ئەوە دەقەکەی بوو؟ دەقی فەرموودەکە دەڵێت : پیاوێکی کوێر هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ووتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆم بپاڕێرەوە کە خوای گەورە چاوم چاك بکاتەوە ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : (ئەگەر دەتەوێ دەتوانی ئارام بگریت ، وە ئەگەر دەتەوێ بۆت دەپاڕێمەوە) کابرا ووتی : بەڵکو بۆم بپاڕێرەوە ، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد کە دەست نوێژ بگرێت و دوو ڕکات نوێژ بکات و بپاڕێتەوە (١) (فەرموودەکە (ترمزی) بە ڕاستی لەقەڵەم داوە).

پێی ووتم : ئەوەی کە ویستم لە فەرموودەکە وەرم گرت ، منیش پێم ووت : ئەمە هەڵخەڵەتاندنە !!چونکە خەڵك وا دەزان کە پێغەمبەر ﷺ خۆی چاوی چاك کردەوە ، لە کاتێکدا دەقی فەرموودەکە لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بۆی پاڕایەوە لە کاتێکدا کە کوێرەکە داوای لێ کرد کە بۆی بپاڕێتەوە ، وە ئەمە موعجیزەیەکی پێغەمبەرە ﷺ ، ئیتر خوای گەورە چاوی پێ بەخشییەوە ، وە پێغەمبەر ﷺ توانای چاك کردنەوەی چاوی نییە ئیتر هەر کەسێکی تریش بێت جگەلە خوای گەورە .

٥- ئەم گۆڕینە ئەوەیە کە ئیبنولقەیم لە (تبدیل النصوص) دا باسی دەکات ، وە ئەم لابردن و نەهێنانی سەرەتای فەرموودەیە کە ماناکە تێك دەدات لە کاری گاورو و جوولەکەیە ، وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە گەلەکەی تێی دەکەون ، کە دەفەرموێ وەکو ئاگادار کەرو ترسێنەرێك (لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا بشبر و ذراعا بذراع ، حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه ، فقالوا : اليهود و النصارى؟ قال : فمن؟) [١] .

واتە: (دوای ڕێگا و سوننەتی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بە بست و زیراع بە زیراع (زیراع واتە دوو بست) هەتا ئەو کاتەی کە بچنە کونی بزن مژەیەکیشەوە ئێوە دوایان دەکەون ، وتیان : گاور وجوولەکە ؟ فەرمووی : ئەی کێی ترن جگە لەوان؟) .

(١) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

## ماناى آمين

موستەحەببە (سوننەتە) بۆ ئەو کەسەی کە سوورەتی فاتیحە دەخوێنێ لە دوای تەواو بونی بڵێت (آمین) واتە خوایە لێمان وەرگرە ، وە لە ڕاستیدا : موستەحەببە بۆ ئەوەش کە لە دەرەوەی نوێژە ، وە لە حەقی نوێژکەریشدا زیاتر جەختی لەسەر کراوە ئیتر ئەگەر بە تەنیا بێت یان ئیمام بێت یان مەئموم وە لە هەموو کارو بارەکانی تری نوێژدا .

١- لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (إذا امن الإمام فأمنوا فانه من واقف تأمينه تأمين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه) [1] واتە : (کاتێ کە ئیمام ووتی (آمین) ئێوەش ئامین بکەن چونکە هەرکەس ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا ڕێك بکەوێت خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێت) .

٢- وە لە گێڕانەوەی موسلیمدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (إذا قال أحدكم في الصلاة آمين و الملائكة في السماء آمين فوافقت احداهما الأخرى غفر له ما تقدم من ذنبه) [2] واتە : (ئەگەر یەکێکتان لە نوێژدا ووتی (آمین) فریشتەش لە ئاسمان ووتیان (آمین) لەگەڵ یەکتردا ڕێك بکەون خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێت) .

٣- وەلە ئەنەسەوە دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (آمین) م پێ بەخشراوە لە نوێژدا و لە کاتی پاڕانەوەدا کە نەبەخشراوە بە هیچ کەسێکی پێش خۆم مەگەر موسا نەبێت ، موسا دەپاڕایەوە و هارون (آمین)ی لەسەر دەکرد ، کەواتە پاڕانەوە بە (آمین) کۆتایی پێ بهێنن چونکە خوای گەورە لێتان وەردەگرێت. [3]

٤- وە لێرەدا هەندێك دادەبڕێن و ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە کە ئەویش ﴿ وقال موسى ربنا انك أتيت فرعون و ملاءه زينة و اموالا في الحيوة الدنيا ربنا ليضلوا عن سبيلك ربنا اطمس على أموالهم و أشدد على قلوبهم فلا يؤمنوا حتى يروا

---

(١) (متفق عليه) (٢) (رواه مسلم)

(٣) (ئەم فەرموودەیە (ابن كثير) هێناویەتی و شێخ موقبیلیش بە لاوازی لە قەڵەم داوە)

www.iqra.ahlamontada.com

العذاب الأليم * قال قد اجيبت دعوتكما فاستقيما ولا تتبعان سبيل الذين لا يعلمون ﴾ (يونس/٨٨-٨٩)

واته : (موسا ووتی : ئەی پەروەردگارمان تۆ بە فیرعەون و دارو دەستەکەیت داوە لەم دونیایەدا جوانی و جوانکاری و ماڵی زۆر کە بەهۆی ئەمەوە خەڵکان گومڕا دەکەن و لە ڕێگای تۆ لایان دەدەن، ئەی پەروەردگارمان ماڵ و سەروەت و سامانیان لەناو بەرە و دڵ و دەرونیان بگوشە و قورسی بکە چونکە باوەڕ ناهێنن هەتا سزای پڕ ئێش و سەخت نەبینن * خوای گەورە فەرمووی : داواو و پاڕانەوەکەتان وەرگیرا و قبوڵ کرا ، خۆ ڕاگر و بە ئارام بن وە ڕێگای کەسانێك مەگرن کە نەزان و نەشارەزان) .

خوای گەورە باسی پاڕانەوەی موسا دەکات بەتەنها بەڵام لە ڕووی قسەکەوە ئەوە دەگەیەنێت کە هارون ئامینی کردووە و گەیشتۆتە پلەی موسا کە پاڕاوەتەوە لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێ (قد اجيبت دعوتكما) واتە پاڕانەوەکەتان وەرگیرا ، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ئامین لەسەر پاڕانەوەیەك بکات وەکو ئەوەوایە کە خۆی پاڕانەوەکەی کردبێت ، لەبەر ئەمە هەندێك دەڵێن : مەئموم پێویست نیيە کە قورئان بخوێنێ چونکە ئامینەکەی لەسەر سوورەتی فاتیحە جێگای خوێندنی دەگرێتەوە ، وە ئەمە بەهەمان شێوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەئموم خوێندنی لەسەر نیيە لەنوێژە دەنگ بەرزەکانیشدا ، خوای گەورەش باشتر دەزانێت .

٥- ئەڵێم : وە ئەمە ڕاستییە کە یەکسانە لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە کە دەفەرموێ : ﴿ وإذا قرىء لقرآن فاسمعوا له و انصتوا لعلكم ترحمون ﴾

واتە : (لە کاتێکدا کە قورئان خوێندرا بێ دەنگ بن و گوێی بۆ ڕاگرن بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ڕ ەحمتان پێ بکات ) .

بەڵێ بێ دەنگ بوون و گوێ گرتن فەرمانێکە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئەوەی بەزەیی پیاماندا بێتەوە ، چونکە کاتێ کە گوێمان گرت و بێ دەنگ بوین دڵ گوشاد دەبێت بۆ تێگەیشتن ، وە کاتێك لە مەبەستەکەی خوای گەورە گەیشتین فەرمانی پێ دەکەین ، ئیتر خوای گەورەش ڕەحم و بەزەیی پیاماندا دێتەوە وەکو پاداشتێك لەسەر ئەوەی کە کارمان کردوە بەوەی کە تێگەیشتووین .

www.iqra.ahlamontada.com

بەڵام کاتێك کە ئیمام بە دەنگی بەرز خوێندی و ئێمەش لەگەڵیدا خوێندمان ئەو کاتە توانامان نی یە لەیەك کاتدا بیخوێنین و تێش بگەین لەوەی کە دەیبیستین ، کاتێکیش کە تێگەیشتن نەهاتەدی کارپێکردنیشی نایەتە دی ، وە کاتێکیش کار پێکردن نەهاتەدی خوای گەورەش ڕەحمەتمان پێ ناکات ، بەهەمان شێوە ئەمە ڕێکەو یەکسانە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ کە دەفەرموێ : (انما جعل الإمام ليؤتم به فاذا كبر ، فكبروا ، و إذا قرأ فأنصتوا ... فەرموودەکە)[1] واتە : (ئیمام بۆ ئەوە دانراوە کە پەیوەست بن پێیەوە ، لە کاتێکدا کە ووتی (الله اكبر) بڵێن (الله أكبر) وە کاتێك کە خوێندی بێ دەنگ بن و گوێ بگرن) .

ئەمە لە نوێژە دەنگ بەرزەکاندا بەڵام لە نوێژە بێ دەنگەکاندا سورەتی فاتیحە واجبە بخوێنرێ لە دوای ئیمامەوە، لێرەدا کاری ئەو فەرموودەیە دێت کە دەفەرموێ : (لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحـــة الكتـــاب) واتە : ( نوێژی ئەو کەسە دروست نی یە هەتا سورەتی فاتیحە نەخوێنێ)[2] .

## کورتەی تەفسیری سورەتی فاتیحە

ئەم سورەتە پیرۆزە یەکەمین جار بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە و بە ناو بردنی ناوە جوان و بەرز و پیرۆزەکانی دەست پێ دەکات ، وە باس کردنی ڕۆژی لێپرسینەوە کە ڕۆژی قیامەتە وە لەسەر ڕێنمویی بەندەکانی بۆ داوا کردن و مل کەچ بوون بۆی ، وە پێدانی تواناو هێز بۆ پاك کردنەوەی نیەت و بەندایەتی کردنی خوای گەورە و جێ بەجێ کردنی یەکخواپەرستی کە بریتیە : لە یەکخواپەرستی لە بەندایەتی خوای گەورەدا ، وە پاك و بێگەرد زانینی لەوەی کە هیچ هاوەڵ و نمونە و شێوەیەکی هەبێت ، وە بۆ داوا کردن تەنها لەو لە ڕێنمویی بۆ ڕێگای ڕاست و دروست کە بریتی یە لە ئایینی بەهێز وە جێگیر کردیان لەسەری هەتا ئەو کاتەی کە ڕێگای (صراط)ی هەست پێکراوی قیامەتیان بۆ ئاسان بێت ، کە بەرەو بەهەشتانێکی خۆش و پڕ کامەرانی و لە خزمەت و هاوەڵایەتی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکاندا بێت .

---

(١) (رواه مسلم)
(٢) (من تعليق محمد نسيب الرفاعي على مختصر تفسير ابن كثير) خوای گەورەش باشتر دەزانێ

www.iqra.ahlamontada.com

وەهەروەها سورەتەکە هاندانە لەسەر کردنی کاری چاکە بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکانیدا بن لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە ترساندن و ئاگادار کردنەوە لە ڕێڕەوە بەتاڵ و پووچەکان بۆ ئەوەی کە حەشر نەکرێن و کۆ نەکرێنەوە لەگەڵ خەڵکانیدا کە بریتین لەو کەسانەی کە توڕەیی و غەزەبی خوای گەورەیان لەسەرەو گومڕاو سەر لێشێواو بوون .

وە چەند جوان لە گێرانەوەی نیعمەت و چاکە بۆ خۆی دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ ﴿ صراط الذين أنعمت عليهم ﴾ وە حەزفی فاعیلی غەزەبەکە دەکات و دەفەرموێ ﴿ غير المغضوب عليهم ﴾.

## مانای ڕێنمونی و گومڕایی

١- هیچ گومان و دوودڵی‌یەك لەوەدا نی‌یە کە ڕێنمونی کردن و گومڕا کردن لە خوای گەورەوەیە ، بەڵام لێرەدا هیچ شتێك نی‌یە مەگەر هۆی تایبەتی خۆی هەیە ؛ لە کاتێکدا کە نکۆڵی و بێ باوەڕی هاتنە دی لەلایەن بێ باوەڕان و هاوەڵ پەیدا کەران لە دوای ڕوون کردنەوەی ڕێگە و چەسپاندنی بەڵگە لەسەریان ، ئەو کاتە وا پێویست دەکات کە خوای گەورە سزایان بدات لەسەر نکۆڵی و بێ باوەڕیان لە خودی کارەکەیان ، کە سزایان دەدات بەوەی لە گومڕاییدا ڕۆیان دەچێنێ ، وەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ فلما زاغوا أزاغ الله قلوبهم ﴾ (الصف/٥)

واتە : (کاتێك کە لە حەق لایاندا خوای گەورە دڵ و دەروونی لە حەق لادان و گومڕای کردن) . وە دەفەرموێ ﴿ وأما من بخل واستغنى * وكذب بالحسنى * فسنيسره لليسرى ﴾ (الليل/٨-١٠)

واتە : (وە ئەو کەسەی کە بە خیلی نواند و لەم ڕێگایە خۆی بێ نیاز کرد ، وە باشترینی بە درۆ دانا ، ئەوجا بۆ دۆزەخ و ڕێگای سەخت ئامادەی دەکەین) .

٢- بەڵام باوەڕداران لە کاتێکدا کە بەرەو حەق هاتن و نیەتیان پاك کردەوە و دڵسۆزانە تێگەیشتن و ڕۆشنبیر بوون و باوەڕیان هێنا ئا لێرەدا جێی خۆیەتی کە لە خودی کارەکەیان پاداشتیان بدرێتەوە و خوای گەورە ڕێگای ڕێنموییان بۆ ڕوون بکاتەوە و زیاتر تێگەیشتن و ڕۆشنبیری و باوەڕیان پێ بدا و تیایاندا

www.iqra.ahlamontada.com

بیهێڵێتەوە ، وەکو چۆن دەفەرموێ : ﴿ فأما من أعطى و اتقى * و صدق بالحسنى * فسنيسره لليسرى ﴾ (الليل/٥-٧)

واتە : (جا ئەوەی کە بەخشش و چاکەی کرد و لەخوا ترسا ، وە باشترینی بە ڕاست دانا ، ئەوا بۆ بەهەشت و ڕێگای ئاسان ئامادەی دەکەین) . کە بەڕاستی ئەمە پاداشتی تەواوەتی‌یە .

٣- وە ئەوەی کە زانراوو ئاشکرایە ئەوەیە کە ڕێنمویی کردن و گومڕا کردن دروست کراون لەلایەن خوای گەورەوە، کە ئەوەیە ڕێنمویی باوەڕداران دەکات بەهۆی وەلاّم دانەوەیانەوە بۆ باوەڕ هێنان ، وە بێ باوەڕان گومڕا دەکات بەهۆی نکۆڵی‌یان و پشت هەڵکردنیان ، کەوەکو ووتمان ئەمە پاداشتی تەواوەتی‌یە ، وە ئەمە ئەوەیە کە (إبن كثير) ئیشارەتی پێ کردووە کە دەفەرموێ (نەك وەکو کۆمەڵەی قەدەری‌یەکان دەیڵێن کە گوایا بەندەکان خۆیان هەڵی دەبژێرن و دەیکەن)

واتە ڕێنمویی و گومڕایی ، چونکە ڕێنمویی کەر و گومڕاکەر خوای گەورەیە بەلاّم بەندەکان خۆیان هۆکان دەگرن و هەڵی دەبژێرن ، وە ئەم هۆیانە بریتین لە تێگەیشتن و کارکردن لەلایەن باوەڕدارانەوە ، و نکۆڵی پشت هەڵکردن لەلایەن بێ باوەڕانەوە وەئەم کردارانە بە دەست خۆیەتی و دیاری کراوە وەهەڵبژاردن پاداشت و سزای لەسەرە ، سەبارەت بە ڕێنمویی ئەوە خودی خۆی، وە گومڕاییش خودی خۆی ، کە هەردوکیان لەلایەن خواوەیە بەتەواوەتی ، خۆ ئەگەر ڕێنمویی لە دەروونی باوەڕدارانەوە بوایە و بەدەست خۆی بوایە خوای گەورە داوای لێ نەدەکرد کە داوای ڕێگای ڕاست بکات ، کە دەفەرموێ ﴿ إهدنا صراط المستقيم ﴾

وە دەفەرموێ ﴿ ربنا لا تزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا ﴾ (آل عمران/٨)
واتە : پەروەردگارمان دڵمان لا مەدە لەحەق لە دوای ئەوەی کە ڕێنموییت کردین.

خوای گەورە و پاك و بێ گەرد خۆی باشتر دەزانێت وە هەر ئەو بۆ ڕاستی ڕێنمویی دەکات [١] .

---

(١) (أنظر مختصر تفسير إبن كثير للرفاعي)

www.iqra.ahlamontada.com

# خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (من صلی صلاة لم یقرأ فیها بأم الکتاب فهي خداج ، خداج ، خداج ، غیر تمام) واتە : ( هەرکەسێك نوێژێك بکات و سورەتی فاتیحەی تیادا نەخوێنێ ئەوا نوێژەکەی تەواو نییە... ... سێ جار ) .

وتیان ئەی ئەبو هورەیرە ئێمە لە دوای ئیمامەوەین ؟ ووتی : لە دەرونی خۆتدا بیخوێنە ، چونکە من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستوە کە فەرموویەتی : خوای گەورە دەفەرموێ : من سورەتی فاتیحەم بەش کردووە لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا بە نیوەیی ، وە بۆ بەندەکەمە ئەوەی کە داوای دەکات ، خۆ کاتێك کە بەندە دەڵێت : ﴿ الحمد لله رب العالمین ﴾ خوای گەورە دەفەرموێ بەندەکەم سوپاسی کردم ، وە کاتێك کە دەڵێ : ﴿ الرحمن الرحیم ﴾ خوای گەورە دەفەرموێ : بەندەکەم ستایشی کردم ، وە کاتێك کە دەڵێ : ﴿ ملك یوم الدین ﴾ خوای گەورە دەفەرموێ بەندەکەم بە گەورەی گرتم ، وە کاتێك کە ووتی ﴿ إیاك نعبد و إیاك نستعین ﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ئەمە نێوانی من و بەندەکەمە وە بۆ بەندەکەمە چی داوا دەکات خۆ کاتێك کە ووتی ﴿ إهدنا صراط المستقیم * صراط الذین أنعمت علیهم غیر المغضوب علیهم ولاالضالین ﴾ خوای گەورە دەفەرموێ : ئەمە بۆ بەندەکەمە وە بۆ بەندەکەمە چی داوا دەکات [1] .

(ابن کثیر) لە دوای ئەم فەرموودەیە دەڵێت (خوای گەورە ئەم بەش کردنەی ڕوون کردۆتەوە لە خوێندنی فاتیحەدا ، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی خوێندنی لە نوێژدا ، وەئەمە لە گەورەترین پایەکانێتی ، لە کاتێکدا خوای گەورە بە موتڵەقی بە نوێژ ناوی دەبات وە مەبەستیشی بەشێکی نوێژە کە خوێندنە ) .

---

(١) (رواه مسلم و غیره)

www.iqra.ahlamontada.com

# ئایا فاتیحە واجبە لەسەر مەئموم

زانایـان جیـان لەســەر خوێندنــی نوێژکــەر لــەدوای ئیمامــەوە لەســەر چــەند بۆچوونێك :

١- واجبە لەسەر موقتەدی کە بیخوێنێ ، وەکو چۆن لەسەر ئیمامەکەی واجبە ، لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتـــاب) [١] واتە : (نوێژی ئەو کەسە دروست نی‌یە کە سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ ) .

٢- واجب نی‌یە لەسەر موقتدی کە بیخوێنێ ئیتر لە نوێژی دەنگ بەرزدا بێت یان لە نوێژی بێ دەنگ بێت بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە (من كان له امام فقـــراءة الامام له قراءة) واتــە : (هــەر کەسێك ئیمامی هــەبوو ئەوا خوێندنی ئیمام بۆ ئەم خوێندنە) بەڵام ئەم فەرموودەیە لە سەنەدەکەی‌دا لاوازی هەیە وەکو چۆن (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا باسی دەکات [٢]

ئەڵێم : ئەگەر فەرموودەکە لاواز بێت جائیز نی‌یە کار پێکردنی ، وە نوێژ جائیز نی‌یە بەبێ خوێندنی فاتیحە .

٣- وا جبە لەسەر موقتـەدی خوێندنـی فاتیحە لـە نوێـژە بـێ دەنگـەکاندا ، وە نیخوێنێ لە نوێـژە دەنـگ بـەرزەکاندا ، لەبـەر ئـەوەی کە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ : (إنما جعل الإمام ليؤتم به ، فإذا كبر فكبروا ، و إذا قرأ فانتصوا) [٣] .

واتە : (ئیمام بۆ ئەوە دانراوە کە پەیوەست بن پێیەوە ، خۆ کاتێك (الله أكبر)ی کرد ئێوەش (الله اكبر) بکەن ، وەکاتێك کە قورئانی خوێند گوێ بگرن و بێ دەنگ بن) .

---

(٢) (متفق عليه)

(٣) (ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی ڕاستە (صحيحە) کە (إبن أبي شيبة) و (دار القطني) و (إبن ماجـــة) و (طحاوي) و (امام أحمـــد) لـە چەند ڕێگایـەکی زۆرەوە ، وە (إبن تيميه) بە بەهێزی دادەنێ ، وە بوصەیری هەندێ لە ڕێگاکانی بە صەحیح دەزانێت ،سەیری (ارواء الغليل) و (صفة الصلاة النـــبي ﷺ) ی ئەلبانی بکە لاپەڕە (١٠٠) کەواتە فەرموودەکە صەحیحە ، بەڵام ئەمە بەڵگەیە بۆ نوێژە دەنگ بەرزەکان کە بریتین لە (بەیانی و مەغریب و عیشا) -وەرگێڕ-) (٣) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

وە ئەمە ووتەی کۆنی ئیمام شافیعیە ، وە گێڕانەوەیەکیشە لە ئیمام ئەحمەدەوە [١]

٤- واجبە لەسەر موقتەدی خوێندنی فاتیحە لە کاتی بێدەنگ بوونی ئیمامدا لە کۆتایی ئایەتەکاندا و لە کۆتایی خوێندنەکەیدا ، وە ئەمە بۆچوونی کۆمەڵێك لەهاوەڵانە و شوێن کەوتووان و دوای ئەوانیش، وە ئەمە بۆچوون و گفتی تازەی ئیمامی شافیعییە.

هەندێك لە پێشین لەو ووتەیەی خوای گەورەدا کە دەفەرموێ ﴿ و إذا قرئ القرآن فاستمعوا له و أنصتوا لعلكم ترحمون ﴾ (الأعراف/٢٠٤)

واتە : (کاتێك کە قورئان خوێندرا گوێی بۆ بگرن و بێ دەنگ بن بەڵکو خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات)

دەڵێن : گوێ گرتنەکە ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان و نوێژی هەینی (ووتاری هەینی) وە لەو کاتەشدا کە ئیمام دەنگی بە خوێندنەوە بەرز دەکاتەوە ، وە ئەمە هەڵبژاردەی ئیبنو جەریرە ، وەکو دەڵێت : مەبەست بەم گوێ گرتن و بێ دەنگ بوونە کاتی دەنگ بەرز کردنەوەی ئیمامە لە نوێژی دەنگ بەرزدا وە لە ووتاری هەینیشدا ، وەکو چۆن چەند فەرموودەیەك هاتووە کە فەرمان بە بێ دەنگ بوون و گوێ گرتن دەکات لە دوای ئیمامەوە و لە کاتی ووتاردا . [٢]

ئەڵێم : ئەگەر موقتەدی گوێی لە خوێندنی ئیمامەکەی نەبوو لە نوێژەدەنگ بەرزەکاندا بەهۆی دووری‌یەوە لێی ، وە بەهۆی نەبوونی موکەبەرەیەکەوە ئەو کاتە واجبە لەسەری کە سوورەتی فاتیحە بخوێنێ .

## چەند هەڵەیەکی دیار لەخوێندنی سورەتی فاتیحەدا

**یەکەم** : خوێندنی قەرئان لەسەر مردووان ، بەتایبەتی سوورەتی فاتیحە :

١- چونکە خوای گەورە قورئانی ناردووە بۆ زیندوان کە کاری پێ بکەن نەك بۆ مردووان خوای گەورە لە بارەی قورئانەوە دەفەرموێ ﴿ لينذر من كان حيا ﴾(يس/٧٠)

واتە : (بۆ ئەوەی کە زیندووان بترسێنێ و ئاگاداریان بکات)

---

(١) (سەیری تەفسیری (ابن کثیر) بکە ١/٢١) (٢) (سەیری تەفسیری (ابن کثیر) ج٢ /٤٤ بکە)

www.iqra.ahlamontada.com

وە لەو فەرموودەیەدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (إذا مات الإنسان إنقطع عمله إلا من ثلاث : صدقة جارية ، أو علم ينتفع به ، أو ولد صالح يدعوا لـه) [1]
واتە : (كاتێك كە مرۆڤ مرد كردارەكانی لێی دەپچڕێ مەگەر لە سێ ڕێگاوە نەبێت : خێرێكی نەبڕاوە كە پێش مردنی كردبێتی و دوای مردنیشی هەر بمێنێت ، یان زانستێكی بڵاو كردبێتەوە و خەڵكان سوودی لێ ببینن لە دوای خۆی ، یان كوڕێكی چاك كە بۆی بپاڕێتەوە) .

٢- (إبن كثير) لە تەفسیرەكەیدا لەكاتی تەفسیر كردنی ئەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ ﴿ و أن ليس للإنسان إلا ما سعى ﴾ (النجم/٣٩)

دەڵێ واتە : وەكو چۆن گوناهی كەسێكی تر ناخرێتە سەر كەسێكی تر ، بەهەمان شێوە پاداشتیشی بۆ نابێت مەگەر ئەوە نەبێت كە پێش دەستی خۆیی خستووە

وە هەر لەم ئایەتە پیرۆزەوە ئیمام شافیعی ئەو حوكمەی ____ كە قورئان خوێندن پاداشتەكەی ناچێت بۆ مردووان ، چونكە ئەم كارە نە لە كرداری ئەوانە و نە خۆیان پێشیان خستووە بۆ خۆیان ، لەبەر ئەمە پێغەمبەر ﷺ نەیكردووە بە سوننەتێك بۆ گەلەكەی ، وە هانیشی نەداوون لەسەری ، وە ڕێنمونیشی نەكردوون بۆ ئەمە بە تاقە دەقێك ، وە نە بە ئاوڕ لێدانەوەیشی ، وە ئەمە نەهاتووە لە هیچ یەكێك لە هاوەڵانەوە خۆ ئەگەر چاك بوایە هاوەڵان پێشمان دەكەوتن و دەیان كرد وەدەرگای نزیك بونەوە لەسەر دەق و بەڵگە وەستاوە ، هیچ جۆرە كار و دەستكاریەكی تیا ناكرێ بە جۆرەكانی قیاس و ڕەئی بەڵام سەبارەت بە پاڕانەوە و خێر كردن ئەمانە كۆی زانایانی لەسەرە لەسەر گەیشتن بە مردوو ، وە لەلایەن خوای گەورە و پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه و سلم) بەڵگەی لەسەر هاتووە [2] .

٣- وە ئافرەتێك لە كەناڵەكانی تەلەفیزۆنەوە گوێی لە سوورەتی فاتیحە دەبێت دەڵێت : من ئەم سوورەتەم خۆش ناوێت ، چونكە براكەمم بیر دەخاتەوە كە مردووە ، وە خوێندووشمە لەسەری ﴿ چونكە مرۆڤ ڕقی لە مردنە وە ئەوەش كە بیری دەخاتەوە ﴾

---

(١) (رواه مسلم)
(٢) بسەیری تەفسیری (إبن كثير) بكە ئایەتی (٣٩) لە سورەتی (النجم) دا)

www.iqra.ahlamontada.com

٤- جێگیر نەبووە لە پێغەمبەر ﷺ وە لە هاوەڵانیش و جگە لەوانیش کە سوورەتی فاتیحەیان خوێندبێت لەسەر مردووان ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ دەیووت بە هاوەڵانی لە تەواو بوونی بەخاك سپاردنی مردووەیەکدا : ( استغفروا لأخیکم و سلوا له التثبیت فإنه الآن یسأل) [1] واتە : (داوای لێخۆش بوون بۆ براکەتان بکەن و دوای جێگیر بوونی بۆ بکەن چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ ) .

٥- پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی فێر نەدەکرد لە کاتی چوونە سەر گۆڕستاندا کەبڵێن (الفاتحە) و سوورەتی فاتیحە) بخوێنن ، بەڵکو فێری دەکردن کە بڵێن : (السلام علیکم أهل الدیار من المؤمنین ، و إنا إن شاء الله بکم لاحقون أسأل الله لنا و لکم العافیة) [2] واتە : (سەلامی خواتان لێ بێت ئەی خەڵکانیئەم گۆڕستانە ، وەئێمە (إن شاء الله) پێتان دەگەینەوە و دێین بۆ لاتان ، داوای لەش ساغی لە سزای خوای گەورە بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش دەخوازین) .

بەڵێ ئەم فەرموودەیە فێرمان دەکات کە بۆ مردووان بپاڕێینەوە بە لەش ساغی و دوور بوون لە سزای خوای گەورە ، نەك لێیان بپاڕێینەوە و داوای یارمەتییان لێ بکەین.

٦- خوای گەورە قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی بخوێنرێ بەسەر ئەو کەسانەدا کە توانای کار پێکردنیان هەیە لە زیندووان ، بەلام مردووان هەرگیز ناتوانن کاری پێ بکەن ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ انما یستجیب الذین یسمعون و الموتی یبعثهم الله ثم إلیه یرجعون ﴾ (الأنعام/٣٩) واتە : (ئەی موحەممەد ئەو کەسە وەلامی بانگی تۆ دەداتەوە کە گوێی لە قسەکانتە و لێی تێ دەگات ، بەلام بێ باوەڕان ئەوانە دڵ مردوون ، خوای گەورە دەیان چوێنێ بە مردووی لاشەکان) [3].

**دووەم** : خوێندنی فاتیحە لەسەر پێغەمبەر ﷺ : هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیـیە نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا ، وە هاوەڵانیش نەیان کردووە ، وە بەڵگەکە هاتووە فەرمان بە درورد و سڵاو دەکات لەسەریئەك سورەتی فاتیحە .

---

(١) (صحیح رواه أبو داود و غیره)    (٢) (رواه مسلم و غیره)

(٣) (سەیری تەفسیری (ابن کثیر) بکە)

www.iqra.ahlamontada.com

١- خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إن الله و ملائكته يصلون على النبي يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه و سلموا تسليما ﴾ (الأحزاب/٥٦) واتە ( خوای گەورە و فریشتەکانی درود و سڵاو لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەن ، دە ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە درودی بۆ بنێرن و سەلامی لەسەر بدەن و ملکەچی فەرمانی ئەوبن)

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات کە درود لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدەین ، نەك فاتیحەی لەسەر بخوێنین ، یان بانگی بکەین بۆ ڕەواندنەوەی خەم و خەفەت و ئێش و ئازار .

٢- وەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشرا)[1] واتە : (هەرکەس درووددێکم لەسەر بدات خوای گەورە دە جار درودی لەسەر دەدات) .

٣- وە دەفەرموێ (بلێن : اللهم صل على محمد و على آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد ، و بارك على محمدو على آل محمد كما باركت على إبراهيم و على آل إبراهيم إنك حميد مجيد) [2] .

وە نزیك بوونەوە (توسل) بە درووددان لەسەرپێغەمبەر ﷺ شیاوە و مەشروعە لەکاتی پاڕانەوەدا چونکە ئەمە لە کردارە چاکەکانە بۆ نمونە دەڵێین : (اللهم بصلاتي على نبيك محمد ﷺ فرج عني كربي و صلى الله على محمد و على آله و سلم) واتە : (خوایە بە درودی من لەسەر پێغەمبەرەکەت موحەممەد ناخۆشیەکەم لەسەر لابەرە وە درود و سەلام لەسەر پێغەمبەرﷺ و یار و شوێن کەوتووانی بێت)

**سێهەم** : خوێندنی سوورەتی فاتیحە لە کاتی ژن مارە کردندا :

١- هیچ بەڵگەیەکی لەسەرنییە نە لە قورئان و نە لە سوونەتدا ، بەڵکو ئەمە لە باوی ناو خەڵکیە ، بە تایبەتی ئەگەر باوەڕیان وا بێت کە مارەییەکە دانامەزرێ مەگەر بە خوێندنی فاتیحە نەبێت ، لە هەمان کاتیشدا کە بزانن کە مارەیی دانامەزرێ مەگەر بە ووتە شەرعەیەکەی خۆی نەبێت کە ئەویش : ووتەی لێپرسراوی کچەکەیە بۆ کوڕەکە یان وەکیلەکەی:

---

(١) (رواه مسلم) (١) (متفق عليه)

www.iqra.ahlamontada.com

( ئەم کچەی خۆمم لێ مارە کردی لەسەر مارەییەك کە نرخەکەی ئەوەندەیە ، کوڕەکەش یان وەکیلەکەی وەڵام دەداتەوە : ئەوا من قبوڵم کرد و ڕازی بووم لەسەر مارە کردنی کچەکەی تۆ لەسەر ئەو مارەیی یەی کە باست کرد )

٢- سوننەت لە مارە کردندا ئەوەیە کە مارە کەر ووتاری پێویستی (خطبة الحاجة) بخوێنێ ، کە پێغەمبەر ﷺ ووتارەکەی پێ دەست پێ کرد ، هاوەڵانیشی فێر کرد کە ووتارەکەیان دەست پێ بکەن کە ئەمە دەقەکەیەتی

(إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره ، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا و سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادى له و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له و اشهد أن محمدا عبده و رسوله

﴿ يا ايها الذين آمنوا إتقوا الله حق تقاته ولاتموتن إلا و أنتم مسلمون ﴾ (آل عمران/١٠٢)

﴿ يا أيها الناس إتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة و خلق منها زوجها و بث منهما رجالا كثيرا ونساء و اتقوا الله الذي تساءلون به و الأرحام إن الله كان عليكم رقيبا ﴾ (النساء/١)

﴿ يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله و قولوا قولا سديدا ، يصلح لكم أعمالكم و يغفر لكم ذنوبكم و من يطع الله و رسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ (الأحزاب/٧٠)

أما بعد :

فإن أصدق الحديث كتاب الله و خير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه و سلم) و شر الأمور محدثاتها و كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار ) [١].

## بیدعەکان

خوێندنی سورەتی فاتیحە بۆ مردووان ، وە بۆ گیانی پێغەمبەر ﷺ ، وە لە کاتی مارە کردندا و جگە لەمانە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی یە لە دیندا ، بەڵکو بیدعەیە و زیادە ڕەوی یە ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد) [٢] واتە ( هەرکەس کارێك ئەنجام بدات فەرمانیئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە وەرنەگیراوە و فڕێ دراوە) .

---

(١) (صحيح رواه النسائي) (١) (رواه مسلم)

www.iqra.ahlamontada.com

وە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێ : (کل بدعة ضلالة و إن رأها الناس حسنة) واتە : (هەموو بیدعەیەك گومڕاییە ئەگەر چی خەڵکیش بە چاکی بزانن) .

وەکۆمەڵێك لە پێشین فەرموویانە (لا تظهر بدعة الا ترك مثلها سنة)

واتە : (هیچ بیدعەیەك ناکرێت مەگەر لە جێگای ئەو سوننەتێك واز لێ دێنرێ ) .

وە ئەم بیدعەو زیادە ڕەوییانە ئەم چەند سوننەتەی مراندووە کە ئەوانیش :

١- پاڕانەوە بۆ مردوو بە جێگیر بوون و زمان پاراوی ، وە داوای لێخۆش بون بۆی ، چونکە فریشتە لە گۆڕەکەیدا پرسیاری ئەوەی لێ دەکات کە پەروەردگارت کێیە ؟ ئایینت چییە ؟ پێغەمبەرەکەت کێیە؟

٢- دروود و سلاو لەسەر پێغەمبەر ﷺ (بوخاری دەفەرموێ : ئەبولعالیە دەفەرموێ : دروودی خوای گەورە ستایشێتی لەلای فریشتەکان وە دروودی فریشتەکان بریتییە لە پاڕانەوە) .

٣- خوێندنی ووتاری پێویستی (خطبة الحاجة) (کە ئیستا باسمان کرد) وە ووتنی (بارك الله لكما و جمع بينكما بخير) بە زاوا.

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

و صلى الله على سيدنا محمد و على آله و صحبه و سلم

تەواو بوو بە پشتیوانی خوای گەورە

www.iqra.ahlamontada.com



# لەم پەراوەدا

1 - لە سورەتی فاتیحە و ناوەکانی و گەورەیی و فەرموودەکانی دەکۆڵێتەوە.

2 - دەدوێ لە شوێنەکانی پەنا گرتن، وە گەورەیی یەکەی و جۆرەکانی و سودەکانی .

3 - دەدوێ لە شوێنەکانی (بسم الله) کردن، وە گەورەیی یەکەی وە سودەکەی وە ماناکەی.

4 - باسی تەفسیری (الحمد لله رب العالمین) وە هەموو ئەو ڕێنماییانەی کە ئایەتەکە دەیکات.

5 - دەدوێ لە مانای (الرحمن الرحیم) و جیاوازی نێوان (الرحمن) و (الرحیم).

6 - باس لە تەفسیری (مالك یوم الدین) و ئەو ڕێنموونییانەی کە ئایەتەکە دەیکات.

7 - باسی مانای (ایاك نعبدوا و ایاك نستعین) دەکات لەگەڵ نهێنی پێشخستنی (مفعول)ەکە.

8 - دەدوێ لەبارەی تەفسیری (اهدنا صراط المستقیم) و جۆرەکانی هیدایەت و ڕێنموێنی.

9 - باسی مانای (صراط الذین انعمت علیهم) و گێرانەوەی نیعمەت بۆلای خوای گەورەو حەزف کردنی (فاعل)ی (غضب) لە (غیر المغضوب علیهم) دەکات.

10- (المغضوب علیهم) کێن؟ (الضالون) مەبەست لە کێیە لە ئایەتەکەدا؟

11- مانای ڕێنموێنی و گومڕایی لە قورئاندا بەگشتی، وە لە ئایەتەکەدا بەتایبەتی.

12- باسی مانای (امین) دەکات و وە جەخت کردنە سەری بەدەنگی بەرز لە نوێژدا وەك کارێك بە فەرموودەکان .

13- کورتەی تەفسیری سورەتی فاتیحە، کە سێ جۆرەکەی یەك خوا پەرستی گرتۆتە خۆ .

14- حوکمی خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژە بێ دەنگەکان و نوێژە دەنگ بەرزەکاندا و باس کردنی ئەو جیاوازیەی کە زانایان هەیانە لە سەری.

15- ئەو هەڵە دەرکەووتوانەی لە خوێندنی فاتیحەدا دەکرێ بۆ پێغەمبەر(ص) و مردووان

ژمارەی سپاردنی (183)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ...

www.iqra.ahlamontada.com